ئەوەشیان هەر ضەعیف و لاوازه

عَنْ جابِرٍ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ( لَا يَؤُمُّ الْمُتَيَمِّمُ الْمُتَوَضِّئِينَ)

أخرجه الدارقطني والبيهقي في (سنن الكبرى) وابن الجوزي في ( العلل المتناهية)

هەروەک ئیمام العقيلي والدارقطني و البيهقي وابن رجب الحنبلي و ابن الجوزي و عبدالعزيز الطريفي و چەندانی تر باسیان کردووه و به ضەعیف و لاوازیان داناوه، لەم کتابانه باسیان کردووه ( الضعفاء للعقيلي،، الكامل لابن العدي،، وتاريخ بغداد للخطيب البغدادي،، و ميزان الإعتدال للذهبي،، و فتح الباري لابن رجب الحنبلي .... )

- دروسته کەسێک تەیەممومی کردووه به هۆکارێک له هۆکاره شەرعییەکان پێشنوێژی بکات بۆ کەسانێک کەوا بەئاو دەست نوێژیان هەڵگرتووه

قالَ ابْنُ حَزْمٍ - : النَّهْيُ عَنْ ذَلِكَ أَوْ كَراهَتُهُ لا دَليلَ عَليهِ مِنْ قُرْآنٍ وَلَا مِنْ سُنَّةٍ وَلَا مِنْ إِجْماعٍ وَلَا مِنْ قِياسٍ

# فەرمووده لاوازەکان ژماره ٤٨

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیه صەحیحه ؟

( مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ عَلِمَهُ ثُمَّ كَتَمَهُ ؛ أُلْجِمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ ) رواه أحمد والترمذي وأبو داود وابن ماجة

واتا // هەرکەسێک پرسیارێکی لێ بکرێت دەربارەی زانستێکی شەرعی کەدەیزانی لەپاشان شاردییەوە ، ئەوە لغاو دەکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا بەلغاوێک لە ئاگر

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أَحْمد و ابن الجوزي و أبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي و چەندانی تر باسیان کردووە

قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ ( لَا يَصِحُّ في هَذَا البَابِ شَيْءٌ )

پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەفەرموێت ( هیچ فەرموودەیەکی صەحیح نەهاتووە لەم بارەیەوە )

بگەڕێوە بۆ کتێبی ( العلل المتناهية) لابن الجوزي لەم کتابەدا ڕوونی کردۆتەوە

## فەرموودە لاوازەکان ژمارە ٤٩

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ قَالَ :

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

( وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَتْلُ مُؤْمِنٍ أَعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ زَوَالِ الدُّنْيَا ) رواهُ التِّرْمِذي و النسائي

واتا // سوێند بە اللَّهُ تَعَالَى کوشتنی بڕوادارێک گەورەترە لەلای اللَّهُ تَعَالَى لە لاچوون و لابردنی دونیا

وەڵام // ئەم فەرموودەیە پاڵنادرێت بۆ لای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ چونکە ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أبو حاتم الرازي و أبو زرعة الرازي والترمذي و النسائي والدارقطني والطبراني وخالد الحايك و أبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي باسیان کردووە،، بەڵکو ئەمە قسەی عەمری کوڕی عاصە رَضِيَ اللَّهُ تَعالَـى عَنْهُ

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ٥٠

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه له نێوان دوو سوجدەكەدا ئەم دوعايه بكەی ؟

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ ( اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَعَافِنِي، وَاهْدِنِي، وَارْزُقْنِي ) رواهُ أبو داود والتِّرْمِذي و ابن ماجة و أحمد

واتا // پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەيفەرموو لەنێوان دوو سوژدەكەدا

( ئەی اللَّه لێم خۆشبه و ڕەحمم پێبكه و سەلامەتم بكه و ڕێنموونيم بكه و ڕزق و ڕۆزيم پێ بده )

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكی ضەعيف و لاوازه هەروەک ئيمام الترمذي و عبدالله بن عبدالرحمن السعد و سليمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي وأبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي و چەندانی تر باسيان كردووه و به ضەعيف و لاوازيان داناوه

- ڕاسته فەرموودەيەكی ضەعيف و لاوازه بەڵام ئاساييه بيڵێی لەنێوان دوو سوژدەكەدا، بەڵام ئەو فەرموودەيه ( اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي )بڵێی صەحيح تره ، ئەگەرچی ئەوەشيان هەر ضەعيف و لاوازه بەڵام لەوەی تر صەحيح تره

نێوانی دوو سوژدەكە شوێنی دوعايه بۆيه هەردوعايێكی چاک بكەی ئاساييه مادام به عەرەبی بێت

## فەرمووده لاوازەكان ژماره ٥١

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه له پێغەمبەرەوه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟

( لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ، وَلَا اللَّعَّانِ، وَلَا الْفَاحِشِ، وَلَا الْبَذِيءِ ) رواه الترمذي و أحمد

واتا // باوەڕدار تانەدەر و نەفرەت لێكەر وجوێندەر و دەم پيس نييه

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكی ضەعيف و لاوازه له پێغەمبەرەوه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەروەک ئيمام علي ابن المديني و ابن أبي شيبة والدارقطني و سليمان بن ناصر العلوان و أبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي باسيان كردووه و بەضەعيف لاوازيان داناوه بەمەرفوعی، بەڵكو ئەم فەرموودەيه فەرموودەی عەبدوڵڵای كوڕی مەسعودييه هەروەک الدارقطني و علوان و ... هتد باسيان كردووه،، وه واتای فەرموودەكه گومانی تێدا نييه كه تەواوه و ڕاسته

## فەرمووده لاوازەکان ژماره ٥٢

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیه صەحیحه و ڕاسته، کاتێک کەسێک دەبینی جلێکی نوێ و تازەی لەبەره پێی دەڵێی ؟

( الْبَسْ جَدِيدًا، وَعِشْ حَمِيدًا، وَمُتْ شَهِيدًا ) رواه ابن ماجة و أحمد.. وحسنه ألباني

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازه هەروەک ئیمام البخاري و يحيى بن معين والنسائي و يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الْقَطَّانُ و أبو حاتم الرازي و البزار وخالد الحايك و مقبل الوداعي وسليمان بن ناصر العلوان و أبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي و چەندانی تر باسیان کردووه و به ضەعیف و لاوازیان داناوه

وَ قَالَ سُلَيْمانُ ابْنُ ناصِرِ العُلْوان ( وَهَذَا خَبَرٌ مُنْكَرٌ بِالِّتِّفَاقِ الحُفَّاظِ )

سولەیمانی کوڕی ناصڕی عولوان وتویەتی ( ئەم فەرموودەیه مونکەره به کۆدەنگی هەموو زانایانی فەرمووده)

## فەرمووده لاوازەكان ژماره ٥٣

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحە كەوا ڕۆژى شەموان مەكروهە و ناپەسەندە ڕۆژووى سوننەتى تێدا بگريت ؟

( لَا تَصُومُوا يَوْمَ السَّبْتِ إِلَّا فِي مَا افْتُرِضَ عَلَيْكُمْ، وَإِنْ لَمْ يَجِدْ أَحَدُكُمْ إِلَّا لِحَاءَ عِنَبَةٍ أَوْ عُودَ شَجَرَةٍ فَلْيَمْضَغْهُ ) أخرجه أبو داود والنسائي والترمذي وأحمد وابن ماجة وصححه ألباني

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكى ضەعيف و لاوازە،هەروەك ئيمام الزهري و الأوزاعي و يحيى بن سعيد القطان و أحمد بن حنبل و أبو داود والنسائي و أبو حاتم الرازي و أبو زرعة و الطحاوي و ابن تيمية وابن القيم و ابن حجر و خالد الحايك و سليمان بن ناصر العلوان و أبو علي الحارث الحسني و عبد العزيز الطريفي و مصطفى العدوي و ابن باز و أبو إسحاق الحويني وە پێشەوا ماليكى كوڕى ئەنەس دەفەرموێت فەرموودەيەكى درۆيە

- زۆر سەيرە زانايانى پێشينەو سەردەم زۆربەى هەرە زۆرى دەفەرموون فەرموودەيەكى ضەعيف و لاوازە، مام ألباني دەڵێت فەرموودەيەكى صەحيحە لا حول ولا قوة الا بالله لەو بەڵايە كەتوشى ئەو ئوممەتە بووە

- دروستە ڕۆژی شەممان ڕۆژووی سوننەت بگریت ئەوش مەزهەبی پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس و هەڵبژاردەی ابن تيمية و ابن القيم و زۆرێک لەزانایانە

- ئەوەی دروست نەبێت بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی هەینییە بە تەنها چونکە فەرموودەی مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ لەسەرە

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

( لا يَصُومَنَّ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إِلَّا يَوْمًا قَبْلَهُ أَوْ بَعْدَهُ ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

## فەرموودە لاوازەکان ژمارە ٥٤

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە لەسەر أبو حنيفة ؟

( يَكُونُ فِي أُمَّتِي رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ أَبُـو حَنِيفَةَ هُوَ سِراجُ الدِّينِ )

واتا // پياوێک دەبێت لە ئوممەتەکەم پێی دەوترێ أبو حنيفة ڕوناك کەرەوە و چرای دينە { ڕێک پێچەوانەکەی تەواوە }

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەکی مەوضوع و هەڵبەستراوە و درۆيە بە کۆدەنگی هەموو فەرموودەناسان، وە ابن الجوزي دەڵێت نەفرەتی الله لەو کەسە بێت کە ئەو فەرموودەيەی داناوە وە شيخ خالد الحايك يش دەفەرموێت مەوضوع و هەڵبەستراوە

هيچ فەرموودەيەکی صەحيح لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەهاتووە دەربارەی ابو حنيفة و پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس و پێشەوا شافيعی و پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل

## فەرموودە لاوازەكان ژمارە ٥٥

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

( مَنِ اسْتَغْفَرَ لِلْمُؤْمِنِينَ وَالمُؤْمِناتِ كَتَبَ اللَّهُ لَــهُ بِكُلِّ مُؤمِنٍ وَ مُؤمِنَةٍ حَسَنَة)
أخرجه الطبراني وَحسَّنه ألباني

واتا // هەركەسێك داوای لێ خۆش بوون بۆ ئيمانداران‌ی پياو و ئافرەت بكات، اللَّهُ تَعَالَى بە ئەندازەی هەريەک لەو پياو و ئافرەتە ئيماندارانە چاكەی بۆ ئەنوسێت

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكی ضەعيف و لاوازە هەروەک شيخ عبدالله بن عبد الرحمن السعد و خالد الحايك و أبو علي الحارث الحسني و سليمان بن ناصر العلوان و مصطفى العدوي باسيان كردووە و بەضەعيف لاوازيان داناوە

- لە سەنەدی ئەم حەديثەدا چەندين پياوی تێدايە فەرموودەكانيان ضەعيف و لاوازن يەكێک لەوانە ( عيسى بن سنان )كەوا پێشەوا ئەحمەدی كوڕی حەنبەل و أبو حاتم الرازي و أبو زرعة الرازي و النسائي و ابن معين.... هتد باسيان كردووە،، وە هەموو ڕيوايەتەكانی ئەم فەرموودەيە ضەعيف و لاوازن

- بەڵام داوای لێ خۆش بوون کردن بۆ ئیمانداران کارێکی زۆر زۆر چاکەو چەندین ئایەتی لەسەرە، ئەگەر چی ئەو فەرموودەیە ضەعیف و لاوازە

قالَ اللَّهُ تَعَالَى

(( فاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ))

((ربِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَنْ دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ))

(( ربَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ))

## فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٥٦

پرسیار // ئايا ئەم فەرمودەیە صەحیحە ؟

( يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ، الصَّابِرُ فِيهِمْ عَلَى دِينِهِ كَالْقَابِضِ عَلَى الْجَمْرِ ) التِّرْمِذي (٢٢٦٠)

واتا // زەمانێک دێت بەسەر خەڵكيدا ئارامگر تێيان دا لەسەر دینەكەی وەكو گرتنی پشكۆ ئاگر وایە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام الترمذي و أبو حاتم الرازي وخالد الحايك و سليمان بن ناصر العلوان و أبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي باسیان كردووە و بەضەعیف لاوازیان داناوە

لەسەنەدەكەدا پیاوێک هەیە بەناوی ( عُمَرُ بنُ شاكِرٍ ) قال الذهبي في ( الكاشف) ضَعَّفَهُ أبو حاتم الرازي

وقال ابن حجر العسقلاني في ( تقريب التهذيب) ضعيف

ئەوەشیان هەر ضەعیف و لاوازە

قيلَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، (أَجْرُ خَمْسِينَ مِنَّا أَوْ مِنْهُمْ ؟ قَالَ : لَا، بَلْ أَجْرُ خَمْسِينَ مِنْكُمْ) رواه أبو داود والترمذي

له فەرموودەیەكی تر هاتووه كەوا یەكێک لەوان پاداشتی ٥٠ پیاوی هەیه، پێی وترا ئەی پێغەمبەری الله پاداشتی ٥٠ كەس له ئێمه یان له خۆیان ، فەرمووی نەخێر بەڵكو پاداشتی ٥٠ كەسی له ئێوه هەیه ،،،، ئەمەشیان هەر ضەعیف و لاوازه هەروەک سلیمان بن ناصر العلوان و أبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي... باسیان كردووه

ئەوه بزانن و بیكەن به قاعیده بۆخۆتان ئێمه هەر چەند باشبین و هەرچی بكەین هەرگیز ناگەینەوه به هاوەڵانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

( لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي ؛ فَلَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا، مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ، وَلَا نَصِيفَهُ ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

## فەرموودە لاوازەکان ژمارە ٥٧

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( لَا يُسْأَلُ الرَّجُلُ فِيمَا ضَرَبَ امْرَأَتَهُ ) سنن أبي داود وابن ماجة و أحمد

واتا // پرسیار لە پیاو ناکرێت و پێی ناوترێت بۆچی لە خێزانی خۆی داوە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی زۆر ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام إبن القطان و الذهبي و الأزدي و خالد الحايك و ماهر الفحل وأحمد شاكر و مصطفى العدوي و ابن باز باسیان کردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

- بێگومان پیاو بۆی نییە بە حەز و ئارەزووی خۆی لە خێزانی بدات و ئازاری بدات، گەر وای کرد زوڵم و ستەمێکی گەورەی کردووە

## فەرموودە لاوازەکان ژمارەی ٥٨

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( أَعْطُوا الْأَجِيرَ أَجْرَهُ قَبْلَ أَنْ يَجِفَّ عَرَقُهُ ) رواه ابن ماجه

واتا // بە کرێکار ببەخشە حەق و ماف و کرێیەکەی پێش ئەوەی ئارەقەکەی وشک بێتەوە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام ابن الملقن و ابن الحجر و سليمان بن ناصر العلوان و أبو علي الحارث الحسني و ابن باز و مصطفى العدوي باسیان کردووە و بەضەعیف لاوازیان داناوە و دەفەرموون هەموو ڕێگاکانی ئەم فەرموودەیە ضەعیف و لاوازن

- ڕاستە فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە، بەڵام گومان لەوەدا نییە کارێکی زۆر باشەو خۆشییەک دەخاتە ناو دڵی ئەم کرێکارە و وای لێ دەکات ماندووبوونی لەبیر چێتەوە

## فەرموودە لاوازەکان ژمارەی ٥٩

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( داوُوا مَرْضاكُمْ بِالصَّدَقَةِ )أخرجه البيهقي والطبراني في الكبير ( ١٠١٩٦ ) والأوسط ( ١٩٦٣ )

واتا // چارەسەری نەخۆشەکانتان بکەن بەسەدەقەکردن

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی زۆر ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أبو حاتم الرازي و الطبراني و ابن عدي والبيهقي وابن الجوزي و ابن الطاهر المقدسي وابن مفلح و الذهبي و عبد الله بن عبد الرحمن السعد و خالد الحايك و أبو علي الحارث الحسني و سليمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي و مصطفى العدوي باسیان کردووە و بەضەعیف لاوازیان داناوە

## فەرمووده لاوازەکان ژمارەی ٦٠

پرسیار // ئایا ئەم فەرمودەیە صەحیحە ؟

( أَحَبُّ الطَّعامِ إِلَى اللَّهِ مَا كَثُرَتْ عَلَيْهِ الأَيْدي ) أخرجه أبو يعلى والطبراني

واتا // خۆشەویسترین و چاکترین خواردن لەلای اللَّهُ تَعَالَى ئەو خواردنەیە دەستی زۆری لەسەر بێت،،بۆ نمونە چەندین کەس لە بەلەمێک یان لەسەر سینییێک خواردن بخۆن

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ابن عدي و المنذري و خالد الحايك ومصطفى العدوي و أبو علي الحارث الحسني و أبو إسحاق الحويني باسیان کردووەو بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

## فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٦١

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( لَوْ كُنْتُ آمِرًا أَحَدًا أَنْ يَسْجُدَ لِأَحَدٍ لَأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِهَا ) رواه التِّرْمِذي وأبو داود وابن ماجة و الدارمي و أحمد

واتا // ئەگەر فەرمانم كردبا بەكەسێک سوجدە ببات بۆ كەسێک ئەوە فەرمانم دەكرد بە ئافرەت سوجدە ببات بۆ مێردەكەی خۆی

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أبو حاتم الرازي و أبو زرعة الرازي والدارقطني وخالد الحايك و أبو علي الحارث الحسني باسیان كردووەو بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

- داواكارم لەو برایانە بە ئایەت و فەرموودەی صەحیح و ڕەوشتە جوانەكەی خۆیان خێزانەكانیان پەروەردە بكەن، نەک بەو فەرموودە ضەعیف لاوازانە

## فەرموودە لاوازەکان ژمارەی ٦٢

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( الرِّبا اثْنانِ وَسَبْعُونَ بابًا أَدْناها مِثْلُ إتْيانِ الرَّجُلِ أُمَّهُ وإنَّ أَرْبَى الرِّبا اسْتِطالَةُ الرَّجُلِ في عِرْضِ أَخِيهِ ) أخرجه الطبراني و ابن ماجة

واتا // ڕیبا ٧٢ دەرگای هەیە ، نزمترین یاخود کەمترین دەرگا و جۆری ڕیبا وەکو ئەوە وایە کەسێک بچێت لەگەڵ دایکی خۆی زینا بکات،، وە خراپترین جۆری ڕیبا زێدەڕۆیی کردن و قسەی ناشرین گوتن و بە سووك تەماشا کردن و باسکردنی ناموسی برای موسوڵمانە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أبو حاتم الرازي وأبو زرعة الرازي والعقيلي والطبراني و ابن الجوزي و وسليمان بن ناصر العلوان و أبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي و أبو إسحاق الحويني باسیان کردووە و بەضەعیف لاوازیان داناوە

وقَدْ تَكَلَّمَ ابْنُ الجَوْزي في كِتابِهِ المَوْضُوعاتِ عَلَى طُرُقِ هٰذا الحَديثِ وَبيَّنَ ضعْفَها ، وقَالَ ( لَيْسَ فِي هَذِهِ الأحاديثِ شَيْءٌ صَحِيحٌ ) (٢/ ٢٤٧)

- زۆر سەیرە غەیبەت کردن گەورەتر بێت لە زیناکردن، جا ئەم زینایەش لەگەڵ دایک بێت، بەبێ شەک و گومان زیناکردن زۆر گەورە ترە لە غەیبەت کردن، بەڵکوو زینا لە ڕیباش گەورەتر و ترسناک ترە بەبەڵگەی ئایەت و فەرموودە

قَالَ عَبْدُ اللَّهِ : قَالَ رَجُلٌ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الذَّنْبِ أَكْبَرُ عِنْدَ اللَّهِ ؟ قَالَ :أَنْ تَدْعُوَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ "قَالَ : ثُمَّ أَيٌّ ؟ قَالَ : ثُمَّ أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ " قَالَ : ثُمَّ أَيٌّ ؟ قَالَ : ثُمَّ أَنْ تُزَانِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ تَصْدِيقَهَا : { وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ } الْآيَةَ ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

# فەرمووده لاوازەکان ژمارەی ٦٣

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

عَنْ وائِلِ بْنِ حُجْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ

(صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَضَعَ يَدَهُ اليُمْنَى عَلَى يَدِهِ اليُسْرَى عَلَى صَدْرِهِ) أخرجه ابن خزيمة وصحَّحه

واتا // وائیلی کوڕی حوجر فەرموویەتی

( نوێژم کرد لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەستی ڕاستەی لەسەر دەستی چەپەی دانا لەسەر سینگی )

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک الذهبي و سليمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي و أبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي باسیان کردووە و بەضەعیف لاوازیان داناوە

- ئەوەی زۆربەی زانایانی لەسەرە لە پێشینە چاکەکانمان ئەوەیە دەستی ڕاستت لەسەر دەستی چەپت دابنێی جا لەهەر شوێنێک داینێی ئاساییە لەسەر سینگ بێت یا ناوک یا لە خوار ناوک یا لەنێوان ناوک و سینگ دا،، چونکە هیچ فەرموودەیەکی صەحیح نییە لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کە بزانین پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەستی لە کوێ داناوە لە ناو نوێژدا، بۆیە چۆن لەلات جوانە و گونجاوە ئاوای داینێ

بگەڕێوە بۆ کتێبی( صفة الصلاة النبي) للعبد العزيز الطريفي

## فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٦٤

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( سَتْرُ مَا بَيْنَ أَعْيُنِ الْجِنِّ وَعَوْرَاتِ بَنِي آدَمَ، إِذَا دَخَلَ أَحَدُهُمُ الْخَلَاءَ أَنْ يَقُولَ : بِاسْمِ اللَّهِ ) رواه الترمذي واللفظ له، و ابن ماجة، والبيهقي

واتا // پەردەی نێوان چاوی جنەكان و شەرمگەی نەوەی ئادەم ئەوەیە ئەگەر یەكێک لەنەوەی ئادەم چووە ئاودەست بڵێت [بسم الله]

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أبو حاتم الرازي و البخاري و أبو زرعة الرازي والترمذي وابن وارة والنسائي والبيهقي و ابن حجر و عبدالله بن عبدالرحمن السعد و سليمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي و أبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي باسیان كردووه

١- قالَ التِّرْمِذيُّ ( هٰذا حَدِيثٌ غَرِيبٌ، لَا نَعْرِفُهُ إِلَّا مِنْ هٰذا الوَجْهِ، وَإِسْنادُهُ لَيْسَ بِذاكَ القَوِي )

٢- قالَ ابْنُ حَجَرٍ في نَتَائِجِ الأَفْكارِ ( لَمْ يَثْبُتْ فِي البابِ شَيْءٌ )

٣- قالَ سُلَيْمانُ ابْنُ ناصِرِ العُلْوان ( لَا يَصِحُّ حَدِيثٌ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ في [الأمْرِ بِالتَّسْمِيةِ] قَبْلَ دُخُولِ الخَلاءِ)

٤- قالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ السَّعْد ( كُلُّ طُرُقِهِ ضَعِيفَةٌ )

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەم دوعایەی دەكرد پێش ئەوەی بچێت بۆ ئاو دەست : ( اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

# فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٦٥

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە كەوا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە سەلام دانەوەی لای ڕاستی ناو نوێژدا دەیفەرموو السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ ؟

عَنْ وائِل بْنِ حُجْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَكَانَ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ ( السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ " وَعَنْ شِمَالِهِ" السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ) سُنَنُ أَبِي دَاوُدَ

وەڵام // نەخێر زیادەی ( وَبَرَكَاتُهُ ) ضەعیف و لاوازە هەروەک سُلَيْمَانُ بْنُ ناصِرُ العُلْوان و عَبْدُ العَزِيزِ الطَّرَيْفي و مُصْطَفَى العَدَوِي باسیان كردووەو بەضەعیف و لاوازیان داناوە،، عَبْدُ العَزِيزِ الطَّرَيْفي دەڵێت هەر ئەصڵی نییە،، سوننەت وایە بڵێی السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ بۆلای ڕاستەو بۆلای چەپە

پرسیار // ئەگەر لە سەلام دانەوەی نوێژدا بڵێم السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ باشترە یان بڵێم السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ ؟

وەڵام // بێگومان هەموو خێرو چاكەیەك لەشوێن كەوتن بۆ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دایە بۆیە وتنی السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ زۆر باشترە لە السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ

## فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٦٦

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( اللَّهُمَّ بَارِكْ لِأُمَّتِي فِي بُكُورِهَا ) رواه التِّرْمِذي وأبو داود وابن ماجة و الدارمي وأحمد

واتا // ئەی اللَّهُ تَعَالَی بەرەكەت بخەیتە سەرەتای بەیانی ئوممەتەكەم

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام البخاري و ابن معين وابن المديني و أبو حاتم الرازي والبزار و أبو علي الحارث الحسني و سليمان بن ناصر العلوان و مصطفى العدوي باسیان كردووە و بەضەعیف لاوازیان داناوە

١- قالَ أَبُو حاتِمِ الرَّازي ( لَا أَعْلَمُ فِيهِ حَدِيثاً صَحيحاً )

٢- قالَ أَبُو عَلِيٍّ الحارِثِ الحَسَني ( لَا يَصِحُّ فِيهِ شَيْءٌ )

٣- قالَ مُصْطَفَى العَدَوِي (كُلُّ طُرُقِهِ ضَعِيفَةٌ )

# فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٦٧

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

( يَكُونُ قَوْمٌ يَخْضِبُونَ فِي آخِرِ الزَّمَانِ بِالسَّوَادِ كَحَوَاصِلِ الْحَمَامِ، لَا يَرِيحُونَ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ) رواهُ أبو داود والنسائي وأحمد

واتا // قەومێک دەبێت لە کۆتايی زەمان دا مووی سپی ڕەنگ دەکەن و دەيگۆڕن بەڕەنگی ڕەش وەکو سينەی کۆتران، ئەم کەسانە بۆنی بەهەشتيش ناکەن

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەکی ضەعيف و لاوازە هەروەك ابن الجوزي و المنذري و الشوكاني وخالد الحايك و سليمان بن ناصر العلوان وعبد العزيز الطريفي و أبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي باسيان كردووه و بە ضەعيف و لاوازيان داناوە

- لە چەندين صەحابە و تابيعين هاتووە پرچيان ڕەشکردۆتەوە و پێيان دروست بووە پرچ ڕەشکردنەوە و ڕيش ڕەشکردنەوە وەکوو (عثمان بن عفان، سعد بن أبي وقاص، عقبة بن عامر، جرير بن عبدالله، عمر بن العاص، الحسن بن علي، الحسين بن علي، الحسن البصري، ابن سيرين، الزهري، نافع بن جبير، إبراهيم النخعي، عروة بن الزبير، موسى بن طلحة، أبو قلابة، أبو سلمة بن عبد الرحمن....... هتد

## فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٦٨

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه ؟

( مَنْ خَضَبَ بِالسَّوَادِ سَوَّدَ اللَّهُ وَجْهَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ) أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ وَابْنُ أَبِي عَاصِمٍ

واتا // هەركەسێك پرچ و ڕيشی گۆڕی بە ڕەنگی ڕەش، اللَّهُ تَعَالَى ڕووی ڕەش دەكات لە ڕۆژی دوايی دا

وەڵام // نە خێر ئەم فەرموودەيه زۆر ضەعيف و لاوازە، هەروەك ئيمام الدارقطني و أبو حاتم الرازي و ابن حجر وإبن عدي و أبو علي الحارث الحسني وە چەندين زانای تريش باسيان كردووە و بە ضەعيف و لاوازيان داناوە، بەڵكو أبو حاتم الرازي دەفەرموێت ئەم فەرموودەيه مەوضوع و هەڵبەستراوە و درۆيه

بەنيسبەت بەسەرهاتەكەی ( أبو قحافة)ش ڕاستە صەحيحه بەڵام ئەم بڕگەی كۆتايی فەرموودەكە ( وَاجْتَنِبُوا السَّوادَ ) ضەعيف و لاوازە هەروەک عبد العزيز الطريفي و سليمان بن ناصر العلوان و أبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي باسيان كردووە

ئەمەش وتەی هەندێک لە زانا گەورەکانی ئوممەت کە پێیانوایە دروستە پرچ و ڕیش ڕەشکردنەوە :

١- قالَ زُهَيْر: قُلتُ لأبي الزُّبَيْر: أَقَالَ جَنِّبُوهُ السَّواد؟ قالَ : لَا

٢- قالَ إبنُ سِيرين ( لَا أَعْلَمُ بِهِ بَأْسَاً )

٣- كانَ الحَسَنُ البَصْري ( لَا يرى بالخِضابِ بِالسَّوَادِ بَأْسَاً )

٤- قالَ إبْرَاهِيمُ النَّخَعِي ( لَا بَأْسَ بِالْوَسْمَةِ ) وَهِيَ الصُبْغُ الْأَسْوَدِ

٥- قالَ مالِكُ بْنُ أَنَسٍ ( لَمْ أَسْمَعْ في ذَلِكَ شَيْئًا مَعْلوماً )

٦- وكَانَ مُحَمَّدُ بْنُ الحَنَفِيَّةِ يَخْضِبُ بِالسَّوَادِ، وَلَمّا سُئِلَ عَنِ الخِضابِ بِالْوَسْمَةِ، قَالَ هِيَ خِضابُنا أَهْلَ الْبَيْتِ

- هیچ فەرموودەیەکی صەحیح لەسەر حەرامییەتی پرچ و ڕیش ڕەشکردنەوە نەهاتووە لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ئەگەرنا ئەو هەموو صەحابە و تابیعینە بەڕێز و خۆشەویستە وایان نەدەکرد، ئەگەر چی خۆشت بپارێزیت لە ڕەنگی ڕەش باشترە بەڵکو لە گومان دەربچیت چونکە هەندێک لە زانایان پێیان دروست نییە ڕەنگی ڕەش

- ئەوەش فەرموودەی صەحیح کە دەبێت پرچ و ڕیشمان بگۆڕین و پێچەوانەی جولەکە و نەسارای بکەین

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

( إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لَا يَصْبُغُونَ فَخَالِفُوهُمْ ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتای فەرموودەکە // خۆشەویست صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی

( بێگومان جولەکە و گاورەکان پرچ و ڕیشیان ڕەنگ ناکەن و نایگۆڕن، ئێوە پێچەوانەیان بکەن و بیگۆڕن )

## فەرموودە لاوازەکان ژمارەی ٦٩

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( الْجَنَّةُ تَحْتَ أَقْدَامِ الأُمَّهَات )

واتا // بەهەشت لە ژێر پێی دایکانە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی زۆر زۆر ضەعیف و لاوازە هەروەک ابن عدي و عبدالله بن عبدالرحمن السعد وخالد الحايك و عبد العزيز الطريفي و سليمان بن ناصر العلوان و ابن باز و مصطفى العدوي و أبو إسحاق الحويني و وە چەندانی تر باسیان کردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە، بەڵکو هەندێکیان دەفەرموون هەر ئەصڵی نییە ئەم فەرموودەیە

- ڕاستە ئەم فەرموودەیە ضەعیف و لاوازە بەڵام چەندەها ئایەت و فەرموودەی صەحیحمان هەیە لەسەر گەورەیی چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوک دا

## فەرموودە لاوازەکان ژمارەی ٧٠

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟

( التَّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ، كَمَنْ لَا ذَنْبَ لَهُ ) ابن ماجة

واتا // کەسی تەوبەکار لە گوناح و تاوان وەکو ئەو کەسە وایە گوناح و تاوانی نەبێت

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أبو نعیم والمنذري و أبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي، أبو إسحاق الحويني بە ضەعیف و لاوازیان داناوە، بەڵکو ئەمە وتەی (عبدالله بن مسعود) ییە هەروەک بەیهەقی باسی کردووە

قالَ اللَّهُ تَعَالَى

(( إِنَّ اللهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ )) سورة البقرة(٢٢٢)

# فەرمووده لاوازەكان ژمارە ٧١

پرسيار // ئايا ئەم فەرمووده بەناوبانگە صەحيحە؟؟

( السَّلَامُ قَبْلَ الْكَلَامِ ) رواهُ التِّرْمِذي

واتا //سەلام كردن پێش قسەكردنە

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكی زۆر ضەعيف و لاوازە هەروەک ئيمام الترمذي و ابن حجر و ابن عدي باسيان كردووه، بەڵكو ابن الجوزي دەڵێت مەوضوع و هەڵبەستراوە و درۆيە

# فەرمووده لاوازەکان ژماره ٧٢

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه ؟

( مَنْ بَدَأَ بِالكَلامِ قَبْلَ السَّلَامِ فَلاَ تُجِيبُوهُ )

ابن السني في"عمل اليوم والليلة"

وأبو نعيم في " الحلية "

واتا // هەرکەسێك دەستى کرد بە قسە کردن پێش سەلام کردن وەڵامى مەدەنەوه

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەکى زۆر ضەعيف و لاوازە هەروەک ئيمام أبو حاتم الرازي و أبو زرعة الرازي و أبو نعيم و ابن عدي و مصطفى العدوي و أبو علي الحارث الحسني باسيان کردووه و بەضەعيف لاوازيان داناوه، بەڵکو أبو زرعة دەفەرموێت هەر ئەصڵى نييە ئەم فەرموودەيە

- ڕاستە ئەو فەرموودانەی باسم کردن ضەعيف و لاوازن، بەڵام گومان لەوەدا نييە سەلام کردن سوننەتە چەندين فەرموودەی صەحيحی لەسەرە، وەڵام دانەوەشی واجبە

قال رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

(خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ وَطُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعًا، ثُمَّ قَالَ : اذْهَبْ فَسَلِّمْ عَلَى أُولَئِكَ مِنَ الْمَلَائِكَةِ، فَاسْتَمِعْ مَا يُحَيُّونَكَ تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ. فَقَالَ : السَّلَامُ عَلَيْكُمْ. فَقَالُوا : السَّلَامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

## فەرمووده لاوازەكان ژمارەى ٧٣

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئاواى فەرموو بێت ؟؟

( أُحِبُّوا العَرَبَ لِثَلاثٍ : لِأَنِّي عَرَبِيٌّ والقُرْآنَ عَرَبِيٌّ وكَلامَ أَهْلِ الْجَنَّةِ عَرَبِيٌّ ) رواه الحاكم في المستدرك، والعقيلي في الضعفاء والطبراني في الكبير

واتا // عەرەبم خۆش دەوێت لەبەر سێ هۆكار، لەبەر ئەوەى خۆم عەرەبم، وە قورئان بە عەرەبييە، وە قسەى بەهەشتييەكان بە عەرەبييە

وەڵام // نەخێر ئەم فەرموودەيە مەوضوع و هەڵبەستراوە و درۆيە هەروەک ئيمام العقيلي و ابن الجوزي والذهبي و أبو حاتم الرازي و الأزدي و سليمان بن ناصر العلوان و وە چەندانى تر باسيان كردووە

## فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٧٤

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

( أُطْلُبوا العِلْمَ وَلَوْ في الصِّين ) خرجه ابن عدي والخطيب في التاريخ

واتا // داوای علم و زانست بكەن و بەدەستی بێنن ئەگەر لە وڵاتی( صين)يش بێت

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكی زۆر زۆر ضەعيف و لاوازە هەروەک ئيمام البخاري و أحمد بن حنبل و أبو حاتم الرازي وابن حبان والعقيلي والبيهقي والذهبي والبزار و ابن الجوزي وخالد الحايك و سليمان بن ناصر العلوان و مصطفى العدوي باسيان كردووە،، بەڵكو ابن حبان و ابن الجوزي و سليمان بن ناصر العلوان و خالد الحايك دەفەرموون هەر مەوضوع و هەڵبەستراوە و درۆيە ئەم فەرموودەيە

## فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٧٥

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە؟؟ كە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی بێت

( لَنْ يَدْخُلَ النَّارَ مَنْ رَآني فِي المَنام )

واتا // ناچێتە ئاگری دۆزەخ ئەو كەسەی منی بینیوە لە خەودا

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی زۆر زۆر ضەعیف و لاوازە هەروەك ئیمام أبو حاتم الرازي و ابن حجر وخالد الحايك وابن باز و مصطفى العدوي و أبو إسحاق الحويني وە چەندانی تر باسیان كردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە،، هیچ فەرموودەیەكی صەحیح نەهاتووە كە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ببینیت لە خەون دا نەچیتە دۆزەخ

# فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٧٦

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( صَلَاةٌ بِسِوَاكٍ خَيْرٌ مِنْ سَبْعِينَ بِغَيْرِ سِوَاكٍ ) أخرجه البيهقي في السنن الكبرى

واتا // نوێژێك بەسیواك باشترە لە حەفتا نوێژ بەبێ سیواك

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی زۆر زۆر ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام يحيى بن معين وابن خزيمة والبيهقي وابن الصلاح وابن القيم والنووي وابن حجر و عبدالله بن عبدالرحمن السعد وخالد الحايك وسليمان بن ناصر العلوان وابن باز و مصطفى العدوي وە چەندانی تر باسیان كردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

- سیواك كردن سوننەتە و كارێكی زۆر چاک و گەورەیە و فەرموودەی صەحیحی زۆری لەسەر هاتووە

- یەكێک لەو كتێبە باشانەی نوسراوە لەسەر فەرموودەی ضەعیف و لاواز كتێبەكەی(ابن القيم) ە بەناوی ( المنار المنيف )

# فەرمووده لاوازەکان ژمارەی ٧٧

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( خَلَقَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ التُّرْبَةَ يَوْمَ السَّبْتِ، وَخَلَقَ فِيهَا الْجِبَالَ يَوْمَ الْأَحَدِ، وَخَلَقَ الشَّجَرَ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ، وَخَلَقَ الْمَكْرُوهَ يَوْمَ الثُّلَاثَاءِ، وَخَلَقَ النُّورَ يَوْمَ الْأَرْبِعَاءِ، وَبَثَّ فِيهَا الدَّوَابَّ يَوْمَ الْخَمِيسِ، وَخَلَقَ آدَمَ عَلَيْهِ السَّلَامُ بَعْدَ الْعَصْرِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، فِي آخِرِ الْخَلْقِ، فِي آخِرِ سَاعَةٍ مِنْ سَاعَاتِ الْجُمُعَةِ، فِيمَا بَيْنَ الْعَصْرِ إِلَى اللَّيْلِ ) رواهُ مُسْلِمٌ

واتا // اللَّهُ تَعَالَى لە ڕۆژی شەممە زەوی دروستکردووە، لە ڕۆژی یەکشەممە چیاکانی تێدا دروستکردووە، لە ڕۆژی دوشەممە درەختی دروستکردووە، لەڕۆژی سێ شەممە شتە بێزراوەکان (المكروه)ی دروست کردووە، لەڕۆژی چوارشەممە نووری دروست کردووە، لەڕۆژی پێنج شەممە ئاژەڵەکانی تێدا بڵاوکردۆتەوە ، لە ڕۆژی هەینیدا دوای عەسر ئادەمی عليه السلام دروست کردووە لەکۆتایی دروستکراوەکاندا لە کۆتا کاتی ساتەکانی هەینی لە نێوان عەسر و شەودا

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەك ئیمام البخاري و ابن معين و علي بن المديني و عبدالرحمن بن هادي و ابن تيمية و البيهقي و ابن القيم وابن كثير وخالد الحايك و مصطفى العدوي و ابن عثيمين وە چەندانی تر بە ضەعیف و لاوازیان داناوە بەمەرفوعی،، بەڵکو ئەمە وتەی ( كَعْبُ الأَحْبار) ە لە ئەهلی کتاب وەری گرتووە و پشتی پێ نابەسترێت

بێگومان لە چەندین ئایەتی قورئان دا هاتووه اللَّهُ تَعَالَی زەوی و ئاسمان و ئەوەی لەو نێوانەش دایە دروستی کردووه بە شەش ڕۆژ، هەروەك

اللَّهُ تَعَالَی فەرموویەتی

( الله الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ مَا لَكُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا شَفِيعٍ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ) سورة السجدة آية ( ٤ )

## فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٧٨

پرسيار // ئایا ئەم فەرموودەیه صەحیحه ؟

( النَّظافَةُ مِنَ الإيمَان ) رواه البلدية

واتا // پاكوو خاوێنی له ئیمانەوەیه،یان پاكوو خاوێنی بەشێكه له ئیمان

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی زۆر زۆر ضەعیف و لاوازه ،، هەروەك شيخ خالد الحايك و سليمان بن ناصر العلوان و ماهر الفحل و عبدالله بن عبدالرحمن السعد و ابن باز و چەندانی تر باسیان كردووه و بە ضەعیف و لاوازیان داناوه

ڕاستە ئەم فەرموودەیە زۆر ضەعیفە، بەڵام فەرموودەی تری صەحیحمان هەیە دەربارەی جوانی و پاكوخاوێنی

١ـ قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمان) رواهُ مُسْلِمٌ

٢ـ قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ( إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ ) رواهُ مُسْلِمٌ

٣ـ قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ( إِنَّ اللَّهَ طَيِّبٌ لَا يَقْبَلُ إِلَّا طَيِّبًا ) رواهُ مُسْلِمٌ

# فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٧٩

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( بِاسْمِ اللَّهِ وَلَجْنَا، وَبِاسْمِ اللَّهِ خَرَجْنَا، وَعَلَى اللَّهِ رَبِّنَا تَوَكَّلْنَا) سنن أبي داود

واتا // بەناوی اللَّهُ تَعَالَی چووینەوە ماڵ وە بەناوی اللَّهُ تَعَالَی دەرچووین لەماڵ ، وەپشتمان بەست بە ( اللَّهُ تَعَالَی ) ی پەروەردیگارمان

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی ضەعیف و لاوازە هەروەک المنذري، خالد الحايك، عبدالله بن عبدالرحمن السعد، سليمان بن ناصر العلوان، مصطفى العدوي باسیان كردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

## فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٨٠

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە كەوا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سێبەری نەبووە ؟

عَن ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما قَالَ ( لَمْ يَكُنْ لِرَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ظِلٌّ )

واتا // پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سێبەری نەبووە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی مەوضوع و هەڵبەستراوە و درۆیە و هەر سەنەدی نییە، بەڵكو سێبەری هەبووە هەروەک مصطفی العدوي و ابن باز و ابن عثيمين باسیان كردووە

- هیچ فەرموودەیەكی صەحیح لەم بارەیەوە نەهاتووە كە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سێبەری نەبووبێت ،، بە كۆدەنگی هەموو زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت پێغەمبەرمان صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ گەورەترین و بەڕێزترین دروست كراوی اللَّهُ تَعَالَى یە، بەڵام زیادە ڕەوییش ناكەین دەربارەی، چونكە ئەویش بەشەر بووە وەكوو ئێمە هەروەک

اللَّهُ تَعَالَى فەرموویەتی (( قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا )) سورة الكهف (١١٠)

## فەرمووده لاوازەکان ژمارەی ٨١

پرسیار// ئایا ئەم فەرمووده بەناوبانگە صەحیحە و ڕاستە ؟

( إِخْتِلافُ أُمَّتِي رَحْمَةٌ )

واتا // جیاوازی و ئیختلافی ئوممەتەکەم ڕەحمەتە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی مەوضوع و هەڵبەستراوە و درۆیێکە کراوە بەدەمی پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، هەروەك عبدالعزيز الطريفي و مصطفى العدوي و ابن باز و وابن عثيمين و چەندانی تر باسیان کردووە

- ئەگەر جیاوازی زانایان ڕەحمەت بوایێ بۆ ئەم ئوممەتە چ کارێکمان بە کۆ دەنگی زانایان دەبوو

قالَ اللَّهُ تَعَالَى

(( كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ وَأَنْزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ )) سورة البقرة (٢١٣)

# فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٨٢

پرسيار // ئەم فەرمودەيەمان زۆر گوێ لێ بووه ئايا صەحيحه ؟

( إنَّ اللَّهَ لَا يَنْظُرُ إِلَى الصَّفِّ الأَعْوَجِ )

واتا // بێگومان اللَّهُ تَعَالَى سەيرى ڕێزى خوار ناكات لەناو نوێژدا

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكى مەوضوع و هەڵبەستراوه و درۆيێكه كراوه بەدەمی پێغەمبەرەوه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ،، هيچ بنچينەيەک و بنەمايەكى نييه، هەروەك عبد العزيز الطريفي و سليمان بن ناصر العلوان و مصطفى العدوي ابن باز و ابن عثيمين باسيان كردووه

- والله سەرم سوڕماوه لەمەلای كورد نازانم بۆ له فەرموودەكان ناكۆڵنەوه ئەو هەمووه فەرمووده صەحيحه هاتووه دەربارەی ئەم بابەته كەچی بەس ئەم فەرمووده ضەعيف و لاوازانه باس دەكەن، نازانن درۆكردن بەدەمی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ گوناهێكی زۆر زۆر گەورەيه با قيامەت بێت ئينجا دەزانن حاڵی مەلايەكانمان چۆنه،، قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ( سَوُّوا صُفُوفَكُمْ ؛ فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ إِقَامَةِ الصَّلَاةِ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

## فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٨٣

پرسیار // ئایا ئەم فەرمودەیە صەحیحەو ڕاستە ؟

( مَنْ كَثُرَتْ ذُنُوبهُ فَعَلَيْهِ بِسَقْيِ الْمَاءِ )

واتا // هەركەسێک گوناح و تاوانی زۆرە پێویستە لەسەری ئاو بدات بەخەڵكی و ئاو ببەخشێت

وەڵام // نەخێر ئاگاداربن ئەمە فەرموودەیەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نییە،، ئەمە وتەی هەندێک لەپێشینە چاكەكانمانە، هەروەك قرطبي لە تەفسیرەكەی دا باسی كردووە دەڵێت ( وقد قال بعض التابعين : من كثرت ذنوبه فعليه بسقي الماء )

قالَ سُلَيْمَانُ بْنُ ناصِرُ العُلْوان

هٰذا الخَبَرُ لا أَصْلَ لَهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يَثْبُتْ عَنِ الصَّحَابَةِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم

شێخ سولەیمانی كوڕی ناصر دەڵێت

ئەم هەواڵە هیچ ئەصڵ و بنەمایەكی نییە لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، وە لەهیچ صەحابەیەكیش نەهاتووە و جێگیر نەبووە

ڕاسته ئەمه فەرموودەیەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نییه بەڵام گومانی تێدا نییه بەخشینی ئاو خێرێكی گەورەیه، اللَّهُ تَعَالَى له پیاوێك خۆش بوو چونكه سەگێكی تێر ئاو كرد، ئەی ئەگەر مسوڵمانێك تێر ئاو بكەی دەبێت خێرەكەی چەندە گەورە بێت

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

(بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ، اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ، فَوَجَدَ بِئْرًا، فَنَزَلَ فِيهَا فَشَرِبَ، ثُمَّ خَرَجَ ؛ فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ، يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ : لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِي كَانَ بَلَغَ بِي. فَنَزَلَ الْبِئْرَ، فَمَلَأَ خُفَّهُ، ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ، فَسَقَى الْكَلْبَ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ، قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَإِنَّ لَنَا فِي الْبَهَائِمِ أَجْرًا ؟ فَقَالَ : نَعَمْ، فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

## فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٨٤

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

يَقُولُ الشَّيْطَانُ (أَهْلَكْتُ بَنِي آدَمَ بِالذُّنُوبِ فَأَهْلَكُونِي بِالْإِسْتِغْفَارِ وَ بِلا إِلهَ إِلَّا اللَّهُ ) أخرجه أبو يعلى في المسند، والطبراني في الدعاء، وابن أبي عاصم في السنة

واتا // شەيتان دەڵێت نەوەی ئادەمم لەناو بردووە و بەهيلاكم داون بەگوناهو تاوان، نەوەی ئادەميش منيان لەناو بردووە و بەهيلاكيان داوم بە داوای لێخۆشبوون كردن و بە وتنی لا إله إلا الله

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكی مەوضوع و هەڵبەستراوە و درۆيە، ئەمە فەرموودەيەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نييە هەروەک شێخ خالد الحايك باسی كردووە،، لەسەنەدەكەدا دوو پياوی تێدايە بەناوی

١ـــعبد الغفور بن عبد العزيز و

٢ـــعثمان بن مطر الشيباني

هەموو زانايان كۆدەنگن لەسەر ئەوەی فەرموودەكانی ئەم دوو پياوە ضەعيف و لاوازن،، بگەڕێوە بۆ كتێبی ( لسان العرب و تهذيب التهذيب)

## فەرموودە لاوازەکان ژمارەی ٨٥

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە کەوا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تەنیا یەک سەلامی داوەتەوە لە نوێژ دا ؟

عَنْ عَائِشَةَ ( أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُسَلِّمُ تَسْلِيمَةً وَاحِدَةً تِلْقَاءَ وَجْهِهِ) رواهُ أبو داود والتِّرْمِذي وابن ماجة و أحمد

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أحمد، ويحيى بن سعيد القطان، ومحمد بن يحيى الزهري، والعقيلي، والدارقطني، وابن عبد البر وابن القيم، وسليمان بن ناصر العلوان، وعبدالعزيز الطريفي باسیان کردووە و بەضەعیف لاوازیان داناوە وە دەفەرموون هەموو ئەو فەرموودانەی هاتوونە لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لە سەلام دانەوەی یەك لا ضەعیف و لاوازن

- سەلام دانەوەی یەکەم لە نوێژدا بە کۆدەنگی هەموو زانایان واجبە ،، سەلام دانەوەی دووەم زۆربەی زانایان دەفەرموون سوننەتە، واتا ئەگەر نەیکەی نوێژەکەت دروستە و قەبووڵە،، هەندێک لەزانایان دەفەرموون سەلام دانەوەی دووەمیش واجبە

## فەرمووده لاوازەكان ژمارەی ٨٦

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

( نَهَى عَنِ الْحُبْوَةِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ )أخرجه أبو داود والترمذي وأحمد

واتا // پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قەدەغەی كردووە لە دانيشتنی حوبوە لەڕۆژی هەينی دا لەو كاتەی ئيمام وتاری دەدا ( حوبوە جۆرە دانيشتنێكە هەروەک لە وێنەكەی خوارەوەدا دیارە ) .

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئيمام أبو حاتم الرازي و يحيى بن معين وابن حبان وابن مفلح والنووي وابن العربي وابن المنذر وابن باز وخالد الحايك و سليمان بن ناصر العلوان و مصطفى العدوي و وأبو مالك كمال بن سيد سالم له ( صحيح فقه السنة ) دا وە چەندانی تر باسيان كردووە و بەضەعيف و لاوازيان داناوە

- زۆربەی زانايان پێيان دروستە ئەم جۆرە دانيشتنە لەكاتی وتاری هەينی دا وەكوو (أنس بن مالك وشريح وصعصعة بن صوحان وسعيد بن المسيب وإبراهيم النخعي ومكحول وابن سيرين ومالك و الشافعي وأحمد بن حنبل وإسحاق وأوزاعي وأصحاب الرأي..... هتد ) وە عبدالله كوڕی عومەر بەم شێوەيە دادەنيشت و ئيماميش وتاری دەدا

- قالَ سُلَيْمَانُ بْنُ ناصِرِ العُلْوان

( كُلُّ الأَحادِيثِ الوارِدَةِ في الإِحْتِباءِ حَالَ الخُطْبَةِ ضَعِيفَةٌ وَقَدْ ثَبَتَ عَنْ جَمْعٍ مِنَ الصَّحَابَةِ أَنَّهُمْ كَانُوا يحتبون حَالَ الخُطْبَةِ).



## فەرمووده لاوازەكان ژماره ٨٧

پرسیار // ئایا ئەم فەرمودەیە صەحیحەو ڕاستە ؟

( لَيَأْتِيَنَّ عَلَى جَهَنَّمَ زَمانٌ تُخْفقُ أَبْوَابُها لَيْسَ فِيهَا أَحَدٌ ) مُعْجَمُ الطَّبَراني

واتا // بێگومان سەردەمێک دێت بەسەر دۆزەخ دا دەرگاكانی دادەخرێن و هیچ کەسێکی تێدا نامێنێت

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی مەوضوع و هەڵبەستراوە و درۆیە، هەروەك، الإمام البخاري والنسائي والدارقطني وابن الجوزي وشعبة وأبو حاتم الرازي والذهبي وسُلَيْمَانُ بْنُ ناصِرُ العُلْوان باسیان کردووە ،، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ( لَا تَكْذِبُوا عَلَيَّ ؛ فَإِنَّهُ مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ فَلْيَلِجِ النَّارَ ) رواهُ البخاري

هیچ فەرموودەیەک لە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و لە صەحابەکان نەهاتووە بە صەحیحی کە بفەرموون دۆزەخ کۆتایی پێ دێت، بەڵکو گومانی تێدا نییە کافر هەتا هەتایێ لە دۆزەخ دەمێنێتەوە، بەڵام مسوڵمانی تاوان بار ئەگەر چووە دۆزەخ بەشێوەیەکی کاتی تێیدا دەمێنێتەوە

قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (( إِنَّ اللَّهَ لَعَنَ الْكَافِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا)) سورة الأحزاب( ٦٤ - ٦٥)

وَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى (( إِلَّا بَلَاغًا مِنَ اللَّهِ وَرِسَالَاتِهِ وَمَنْ يَعْصِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ))سورةُ الجِنِّ ( ٢٣ )

- بگەڕێنەوە بۆ كتێبی (تنبيه المحتار على عدم صحة القول بفنار النار على صحابة الأخيار) دانەری ئەم كتێبەش سُلَيْمَانُ بْنُ ناصِرُ العُلْوان ه

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ٨٨

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

(عِنْدَ كُلِّ خِتْمَةٍ لِلْقُرْآنِ دَعْوَةٌ مُسْتَجابَةٌ)أخرجه الديلمي في الفردوس،، وأبو نعيم في الحلية

واتا // لەكاتى هەموو ختمێك بۆ قورئان دوعايەكى قەبووڵ كراو هەيە

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكى زۆر زۆر ضەعيف و لاوازە،،، هەروەك ئيمام النسائي، ابن معين، ابن حبان، ابن عدي، الذهبي، ابن حجر، خالد الحايك،سليمان بن ناصر العلوان، عبد العزيز الطريفي، مصطفى العدوي، وە چەندانى تريش باسيان كردووە كردووەو بە ضەعيف و لاوازيان داناوە، بەڵكو هەندێ لەزانايان دەفەرموون ئەم فەرموودەيە درۆيە و هەڵبەستراوە

- دوعاى ختمى قورئان لە ناو نوێژدا بيدعەيە و داهێنراوە، هەروەك شاطبي و خالد الحايك و سليمان بن ناصر العلوان باسيان كردووە،،، بەڵام لە دەرەوەى نوێژدا ئەنەسى كوڕى ماليک و كۆمەڵێك لە پياو چاكان كردوويانە، ئەنەسى كوڕى ماليک كە ختمى دەكرد ماڵ و منداڵى كۆ دەكردەوە و دوعاى دەكرد، جا هەردوعايێک بێت نەك بەس ئەو دوعايەى نوسرايتەوە لە كۆتايى قورئان دا، بەهەر زمانێک بێت دروستە بە (كوردى، عارەبى، ئينگليزى...) وە ئەگەر ئەم دوعايەش نەكەى زۆر زۆر ئاساييە، چونكە ئەم دوعايە نەهاتووە لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كە كردبييەتى

## فەرمووده لاوازەكان ژماره ٨٩

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

( لاتَقُولوا: رَمَضَانَ ؛ فإنَّ رَمَضَانَ إِسْمٌ مِنْ أَسْماءِ اللَّهِ، وَلكِنْ قُولُوا: شَهْرُ رَمَضَانَ ) أخرجه البيهقي في السنن الكبرى

واتا // مەڵێن ڕەمەزان بێگومان ڕەمەزان ناوێکە لە ناوەکانی اللَّهُ تَعَالَی، بەڵکوو بڵێن مانگی ڕەمەزان

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی زۆر زۆر ضەعیف و لاوازە، هەروەك ئیمام البخاري، أبو داود، النسائي، ابن عدي، البيهقي، ابن الجوزي، ابن حجر، الشوكاني، سليمان بن ناصر العلوان، عبد الله بن عبد الرحمن سعد، وەچەندین زانای تر باسیان کردووەو بە ضەعیف و لاوازیان داناوە ، بەڵکو ابن الجوزي و سليمان بن ناصر العلوان دەفەرموون فەرموودەیەکی موضوع و هەڵبەستراوە

- دروستە بڵێی ڕەمەزان هەروەک چۆن دروستە بڵێی مانگی رەمەزان،، ڕەمەزان ناوی (اللَّهُ تَعَالَی) ی نییە

# فەرموودە لاوازەکان ژمارە ٩٠

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( العَجَلَةُ مِنَ الشَّيْطَانِ ) رواه الترمذي

واتا // پەلە کردن لە شەیطانەوەیە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام البخاري، النسائي، ابن حبان، ، ابن حجر، سليمان بن ناصر العلوان، وە چەندین زانای تر باسیان کردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

- بەڵام لەگەڵ وەش دا سیفەتێکی باش مسوڵمان پەلە پەل بکات لەکارەکانی دا

## فەرمووده لاوازەکان ژماره ٩١

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە، کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خێزانەکانی خۆی ماچ کردووەو دەست نوێژی هەڵنەگرتیتەوە ؟

عَنْ عَائِشَةَ( أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبَّلَ بَعْضَ نِسَائِهِ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ وَلَمْ يَتَوَضَّأْ ) رواهُ التِّرْمِذي، وأبو داود، والنسائي، وابن ماجة، وأحمد

واتا //بێگومان پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەندێک لە خێزانەکانی ماچ دەکرد، لە پاشان دەردەچوو بۆ نوێژ و دەست نوێژی هەڵنەدەگرتەوە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أبو سفيان الثوري، أحمد بن حنبل ، البخاري، يحيى بن معين، ابن المديني، أبو حاتم الرازي، الترمذي، ابن القطان، الدارقطني، البيهقي، سليمان بن ناصر العلوان، عبدالعزيز الطريفي، مصطفى العدوي، وە چەندانی تر باسیان کردووەو بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

- ئەگەرچی ئەم فەرموودەیە ضەعیف و لاوازە بەڵام هیچ فەرموودەیەکی صەحیح و ڕاست نەهاتووە لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ئەگەر پیاو خێزانی خۆی ماچ بکات یان دەستی لێ بدات دەست نوێژی بشکێت ، بۆیە دەست نوێژ لە هیچ ئافرەتێک ناشکێت، وە ئەگەر پیاوێک خێزانەکەی خۆی ماچ کرد ئەویش دەست نوێژەکەی ناشکێت

## فەرمووده لاوازەكان ژماره ٩٢

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟

(مَنْ تَوَضَّأَ فَقالَ سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إلَه إلَّا أنتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ) رواه النسائي

واتا // هەركەسێك دەست نوێژی هەڵگرت لەپاشان وتی پاكی و بێگەردی بۆتۆ ئەی اللَّه لەهەموو كەم و كورتييەك و هاوبەشييەك، وەسوپاس و ستايش بۆتۆ، شاهێدی دەدەم هيچ پەرستراوێک نييه بەحەق و ڕاستی جگە لەتۆ، داوای لێ خۆشبوونت لێ دەكەم و بۆلای تۆ دەگەڕێمەوە

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكی ضەعيف و لاوازەو بۆلای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بەڵكو ئەمە وتەی ( أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيّ )ە،، هەروەك ئيمام النسائي،الدارقطني، المباركفوري، عبدالعزيز الطريفي وە چەندين زانای تر باسيان كردووە،، ئەم فەرموودەيە بە مرفوعی ضەعيف و لاوازە، بە مەوقوفی صەحيحە و ڕاستە

ڕاستە ئەمە فەرموودەی أبو سعيد الخدري يە بەڵام دروستە كارپێكردنی و حوكمی مەڕفوعی بۆ هەيە واللَّهُ تَعَالَى أَعْلَمُ

# فەرمووده لاوازەکان ژماره ٩٣

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

( اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ ) رواهُ التِّرْمِذي

واتا // ئەی اللَّهُ تَعَالَی بمگێڕی لە تەوبەکاران، وە بمگێڕی لە پاك و خاوێن ڕاگران

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أحمد، الترمذي، ابن حجر، خالد الحايك، سليمان بن ناصر العلوان، عبد العزيز الطريفي، عبدالله بن عبد الرحمن سعد، مصطفى العدوي، أحمد شاكر، وەزۆرێک لەزانایانی تر پێیان وایە ضەعیف و لاوازە

ئەم دوعایە صەحیحە لە پێغەمبەرەوە صَلَّی اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کاتێک دەست نوێژی هەڵدەگرت دەیفەرموو ( أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ ) رواهُ مُسْلِمٌ

## فەرمووده لاوازەکان ژمارە ٩٤

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

( تَوَضَّؤُوا بِاسْمِ اللَّهِ ) رواهُ أحمد و النسائي

واتا // دەست نوێژ هەڵگرن بەناوی اللَّهُ تَعَالَى

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەکی ضەعيف و لاوازە هەروەک ئيمام أحمد، البخاري، العقيلي،الدارقطني، ابن المنذر، البزار، خالد الحايك، سليمان بن ناصر العلوان، عبدالعزيز الطريفي، مصطفى العدوي وە چەندانی تريش باسيان کردووەو بە ضەعيف و لاوازيان داناوە

- هيچ فەرموودەيەکی صەحيح نەهاتووە لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەربارەی بسم الله کردن لەکاتی دەست نوێژ هەڵگرتن دا هەروەک ئيمام أحمد و العقيلي وابن المنذر و خالد الحايك و عبد العزيز الطريفي وەچەندانی تر باسيان کردووە،،، ئەگەر چی زۆربەی زانايان پێيان وايە بسم الله کردن لەکاتی دەست نوێژدا کارێکی چاکەو سوننەتە واللَّهُ تَعَالَى أَعْلَمُ بەڵام بەڵگەيان بەس فەرموودەی ضەعيف و لاوازە

# فەرمووده لاوازەکان ژماره ٩٥

پرسیار // ئایا ئەم فەرمودەیە صەحیحە ؟

( لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَا وُضُوءَ لَهُ، وَلَا وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ تَعَالَى عَلَيْهِ) رواه أحمد و أبو داود وابن ماجة

واتا // نوێژ دروست نییە بۆ کەسێک دەست نوێژی نەبێت، وە دەست نوێژ دروست نییە بۆ کەسێک (بسم الله) ی نەگۆتبێت لە دەست نوێژەکەیدا

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أحمد، البخاري، العقيلي، ابن المنذر، البزار، خالد الحايك، سليمان بن ناصر العلوان، عبد العزيز الطريفي، مصطفى العدوي وە چەندانی تریش باسیان کردووەو بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ٩٦

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

( لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يَكُونَ هَواهُ تَبَعًا لِمَا جِئْتُ بِهِ )

واتا // ئيمانی تەواو نابێت يەكێک لە ئێوه، تا ئەوكاتەی هەواو ئارەزووی شوێن كەوتووی ئەوه دەكەوێت كەمن پێی هاتوومە

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكی ضەعيف و لاوازه هەروەک ئيمام أبو داود، النسائي، أبو زرعة الدمشقي،أبو عروبة الخوافي، ابن رجب الحنبلي، سليمان بن ناصر العلوان، ابن باز، مصطفى العدوي وه چەندانی تر باسيان كردووەو بە ضەعيف و لاوازيان داناوه

# فەرموودە لاوازەکان ژمارە ٩٧

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

(إنَّ اللهَ تَجَاوَزَ لِي عَنْ أُمَّتِي: الْخَطَأَ، وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ)رواهُ ابن ماجة والبيهقي

واتا // بێگومان اللَّهُ تَعَالَى خۆش بووە لە ئوممەتەکەم لەبەر من ، لەوگوناهەی بەهەڵە دەکرێت، یان بەهۆی لەبیرچوون دەکرێت، یان بەزۆر پێیان دەکرێت

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أحمد، أبو حاتم الرازي،ابن عدي، ابن رجب الحنبلي، سليمان بن ناصر العلوان، مصطفى العدوي وە چەندانی تریش باسیان کردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

- ئەگەرچی فەرموودەکە ضەعیف و لاوازە، بەڵام واتای فەرموودەکە زۆر تەواوە چونکە بەڵگە هەیە لە قورئان و سوننەتدا، اللَّهُ تَعَالَى دەفەرموێت (رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا)سورة البقرة،، وە دەفەرموێت اللَّهُ تَعَالَى ( إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ) سورة النحل

# فەرموودە لاوازەکان ژمارە ٩٨

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودە درێژەی لە الأَرْبَعُونَ النووية دا هاتووە صەحیحە ؟

عن معاذِ بنِ جَبَلٍ رَضِي الله عَنْهُ، قالَ: قُلْتُ: يا رَسُولَ اللهِ، أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُني الجَنَّةَ ويُباعِدُني عَنِ النَّارِ. قالَ: {لَقَدْ سَأَلْتَ عَنْ عَظِيم، وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللهُ تَعالَى عَلَيْهِ؛ تَعْبُدُ اللهَ لاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ، وَتَحُجُّ الْبَيْتَ}. ثمَّ قَالَ: {أَلاَ أَدُلُّك عَلَى أَبْوَابِ الْخَيْرِ؟ الصَّوْمُ جُنَّةٌ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ، وَصَلاَةُ الرَّجُلِ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ}. ثُمَّ تَلاَ: (تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ..) حَتى بَلَغَ: (يَعْمَلُونَ) . ثُمَّ قالَ: {أَلاَ أُخْبِرُكَ بِرَأْسِ الأَمْرِ وَعَمُودِهِ وَذِرْوَةِ سَنَامِهِ؟}.

قُلْتُ: بَلى يَا رسولَ اللهِ .

قالَ: {رَأْسُ الأَمْرِ الإِسْلاَمُ، وَعَمُودُهُ الصَّلاَةُ، وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ}. ثمَّ قالَ: {أَلاَ أُخْبِرُكَ بِمِلاَكِ ذَلِكَ كُلِّهِ؟}.

قلتُ: بلى يا رسولَ اللهِ. فَأَخَذَ بِلِسَانِهِ وقالَ: {كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا}

قُلْتُ: يا نَبِيَّ اللهِ، وإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ به؟

فقالَ: {ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ، وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ أو قالَ: عَلَى مَنَاخِرِهِم إِلاَّ حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ}رواه التِّرمذيُّ

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أحمد، أبو حاتم الرازي، أبو زرعة الدمشقي، ابن رجب الحنبلي، سليمان بن ناصر العلوان وە چەندانی تر باسیان کردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە.

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ٩٩

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه ؟

(ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبَّكَ اللَّهُ، وَازْهَدْ فِيمَا فِي أَيْدِي النَّاسِ يُحِبَّكَ النَّاسُ ) رواهُ ابن ماجة

واتا // واز لەو شتانەی دونيا بێنه كەسودی نييه بۆ قيامەتت،اللَّه خۆشی دەوێی، وه وازيش بێنه لەو شتانەی لەلای خەڵكييه خەڵكيش خۆشيان دەوێی

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكی ضەعيف و لاوازه هەروەک ئيمام أحمد، البخاري، أبو حاتم الرازي، يحيى بن معين، أبو زرعة، العقيلي، ابن رجب الحنبلي، سليمان بن ناصر العلوان، مصطفى العدوي، لەگەڵ چەندين زانای تر باسيان كردووه و به ضەعيف و لاوازيان داناوه

- سُبْحَانَ اللَّهِ بەهەزاران فەرموودەی صەحيح و ڕاستمان هەيه نازانم بۆ خەڵكی بەو فەرمووده لاوازو ضەعيفانەی وەگرتووه، ئەگەرچی واتای فەرموودەكەش زۆر جوان و چاكه

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٠٠

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

(مِنْ حُسْنِ إِسْلاَمِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لاَ يَعْنِيهِ) رواهُ التِّرْمِذيُّ وغيْرُهُ

واتا // لەجوانی ئایینی مرۆڤ وازهێنان و دوور كەوتنەوەيە لەو شتەی پەیوەندی پێیەوە نییەو پێویستی پێی نییە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أحمد، یحیی بن معین، البخاري، الدارقطني، ابن رجب الحنبلي،عبدالله بن عبدالرحمن السعد، سليمان بن ناصر العلوان، خالد الحايك، مصطفى العدوي باسیان كردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

- ئەگەر چی واتای فەرموودەكە زۆر تەواو و جوانە، وە ئەمە وەسیەتی زۆرێک لە پیاوچاكانی ئەو ئوممەتەیە

## فەرموودە لاوازەكان ژمارە ١٠١

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

( إِذَا رَأَيْتُمُ الرَّجُلَ يَتَعَاهَدُ الْمَسْجِدَ، فَاشْهَدُوا لَهُ بِالْإِيمَانِ....) رواه الترمذي وابن ماجة و الدارمي و أحمد

واتا // ئەگەر پياوێكتان بينى بەردەوام هاتوو چۆى مزگەوت دەكات شاهێدى ئيمانى بۆ بدەن و كەسێكى ئيماندارە

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكى زۆر ضەعيف و لاوازە هەروەک ئيمام أحمد و النسائي وأبو حاتم الرازي و أبو داود و الدارقطني وابن رجب الحنبلي و الذهبي و ابن حجر و أبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي و أبو إسحاق الحويني و ابن باز و وەچەندانى تريش باسيان كردووە و بەضەعيف لاوازيان داناوە

- لەسەنەدى ئەو فەرموودەيە دا { دَرَّاج أَبو السَّمْحِ } ى تێدايە ئيمام أحمد و نسائي و أبو داود و الدارقطني و البرقاني و أبو حاتم الرازي و الذهبي و وەزۆرى تريش قسەيان كردووە لەسەر فەرموودەكانى و بەضەعيف لاوازيان داناوە ،، هەركاتێک دَرَّاج أَبو السَّمْحِ فەرموودەى گێڕاوە لە أَبِو الْهَيْثَمِ ئەوە بزانن فەرموودەكە ضەعيف و لاوازە هەروەک زانايان فەرموويانە جا لەم فەرموودەيەش دا دَرَّاج أَبو السَّمْحِ لە أَبِو الْهَيْثَمِ گێڕاوەتەوە

# فەرموودە لاوازەکان ژمارە ١٠٢

زۆر زۆر ئەو فەرموودەمان گوێ لێ ئەبێت  لە وتاری هەینی دا مەلایەکان باسی دەکەن

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( ادْعُوا اللَّهَ وَأَنْتُمْ مُوقِنُونَ بِالْإِجَابَةِ ) رواه الترمذي وأحمد

واتا // داوا لە اللَّهُ تَعَالَی بکەن وە ئێوە دڵنیابن وەڵامتان دەداتەوە

وەڵام //نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام علي ابن المديني و أبو حاتم الرازي و البخاري و أبو زرعة الرازي و النسائي والترمذي و الدارالقطني وأبو داود والذهبي و ابن حجر و أبو علي الحارث الحسني و مصطفی العدوي و أبو إسحاق الحويني و چەندانی تریش باسیان کردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

لەسەنەدی ئەو فەرموودەیە دا { صَالِحٌ الْمُرِّيُّ } ی تێدایە زانایان قسەیان لەسەر کردووەو فەرموودەکانیان بە ضەعیف و لاواز داناوە وەکوو علي بن المديني و أحمد بن حنبل والبخاري و أبو زرعة الرازي و أبو حاتم الرازي و الدارالقطني و النسائي و أبو داود و الفلاس و ابن حبان و ابن حجر و والذهبي و ابن عدي و حماد بن سلمة وەزۆری تریش باسیان کردووە

لەگەڵ وەش دا صَالِحٌ الْمُرِّيُّ کەسێکی زۆر زۆر دیندار و لە اللَّه ترس بووە و کەسێکی زۆر زاهید بووە

## فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٠٣

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

(مَنِ احْتَجَمَ لِسَبْعَ عَشْرَةَ وَتِسْعَ عَشْرَةَ وَإِحْدَى وَعِشْرِينَ كَانَ شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ) رواهُ أبو داود، والترمذي و ابن ماجة و أحمد

واتا // هەركەسێك حیجامەی كرد (كەڵە شاخ) ی كرد لە حەڤدە و نۆزدە و بیست و یەكی مانگی عارەبی دا ئەوە دەبێتە هۆی شیفا بۆ هەموو دەردێک و نەخۆشیێك

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أبو زرعة و أبو حاتم الرازي و عبد الرحمن بن مهدي والعقيلي وابن الجوزي و خالد الحايك و سليمان بن ناصر العلوان و مصطفى العدوي و وە چەندانی تر باسیان كردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

هیچ فەرموودەیەكی صەحیح لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەهاتووە لەسەر دیاریكردنی ڕۆژی حیجامەكردن چ بە باشە چ بەخراپە، هەروەك ئەو زانایانەی ناوم بردن باسیان كردووە لەگەڵ چەندین زانای تر،، بۆیە لە هەركاتێک یان لە هەر ڕۆژێک دا حیجامە بكرێت سودی هەیە و دەبێتە شیفا بإذن الله تعالى هەروەک لە صەحیحی بوخاری دا هاتووە

# فەرموودە لاوازەکان ژمارە ١٠٤

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

(أَبْغَضُ الْحَلَالِ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى الطَّلَاقُ) رواهُ أبو داود وابن ماجة

واتا // بوغزاویترین و بێزراوترین حەلاڵ لەلای اللَّهُ تَعَالَى تەڵاقە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أبوحاتم الرازي ، یحیی بن معین، المنذري، ابن القیم، البیهقي ، عبد العزیز الطریفي ، مصطفی العدوي وە چەندانی تر باسیان کردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

- ڕاستە جودابونەوەی نێوان پیاو و ژن کارێکی زۆر دڵ خۆشکەرە بۆ ئیبلیس، بەڵام زۆر جاریش دەبێتە هۆی ڕەحمەت بۆ ژن و پیاوەکە

# فەرمووده لاوازەكان ژمارە ١٠٥

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

(لَا يَقْرَأُ الْجُنُبُ وَالْحَائِضُ شَيْئًا مِنَ الْقُرْآنِ) رواهُ التِّرْمِذي و ابن ماجة و الدارمي

واتا // كەسى بێنوێژ و ئافرەتى حەيزدار هيچ شتێک له قورئان ناخوێننەوە (واتا نابێت قورئان بخوێننەوە )

وەڵام //نەخێر فەرموودەيەكى ضەعيف و لاوازە هەروەک ئيمام أحمد و يحيى بن معين و أبو حاتم الرازي و سليمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي و مصطفى العدوي و ابن باز و ئەوانەى تريش باسيان كردووە و بە ضەعيف و لاوازيان داناوە

- هيچ فەرموودەيەكى صەحيح له پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەهاتووە لەم بارەيەوە ، هەرچى ئافرەتە لەكاتى حەيز و سوڕى مانگانەدا يان له دواى منداڵبوون دا بە هەموو شێوەيەک بۆى دروستە قورئان بخوێنێتەوە ، خۆ ئەگەر بەپەنجەوانەكەى دەستى قورئانەكە بگرێت و پەڕەكانى هەڵبداتەوە بێگوومان باشترە ، وە دەربارەى ئەو ژن و پياو و گەنجەى كە تووشى جەنابەت و لەشگرانى بوونە چەندى دەكرێت قورئان نەخوێننەوە بەڵكو له گومان دەربچن ئاوا بۆ قيامەتيان باشترە ئەگەرچى هيچ بەڵگەيەكى صەحيحمان نييە لەو بابەتە بەڵام زۆربەى زانايان پێيان دروست نييە قورئان بخوێننەوە

## فەرمووده لاوازەکان ژماره ١٠٦

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە و ڕاستە ؟

( هَذَا فِرْعَوْنُ أُمَّتِي) مسند إمام أحمد (٣٨٢٤،،٣٨٢٥،،٤٢٤٦،،٤٢٤٧)

واتا // ئەوە (أبو جهل) فیرعەونی ئومەتی منە،، دوای ئەوەی هەواڵی کوشتنی (أبو جهل) یان بە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕاگەیاند ، فەرمووی ئەمە فیرعەونی ئەم ئوممەتەیە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە، هەروەك ابن حزم و شعيب الأرنؤوط و مصطفى العدوي و أبو إسحاق الحويني و چەندانی تر باسیان کردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە، هیچ فەرموودەیەکی صەحیح لەم بارەیەوە نەهاتووە کە (أبُو جهل) فیرعەونی ئەم ئوممەتە بێت

فیرعەونەکانی ئەو سەردەمە زۆر کافرتر و بێدین تر و خراپە کارترن لە( أبو جهل) ی موشریك و کافری سەردەمی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و اللَّهُ تَعَالَى أَعْلَمُ

## فەرموودە لاوازەکان ژمارە ١٠٧

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە؟

(قَالَ أَبُو بَكْرٍ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ شِبْتَ قَالَ :شَيَّبَتْنِي هُودٌ وَالْوَاقِعَةُ وَالْمُرْسَلَاتُ وَ { عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ } وَ { إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ }) سُنَنُ التِّرْمِذِي

واتا //أبو بكر الصديق فەرمووى ئەى نێردراوى اللَّه پير بووى، پێغەمبەريش صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووى سوورەتەکانى (هوود و واقيعەو نەبەء و تەکوير) پيريان کردم

لە ڕيوايەتێکى تردا فەرموويەتى (شَيَّبَتْنِي هُودٌ وَأَخَواتُهَا)

واتا // (سورەتى هوود) و هاوشێوەکانى پيريان کردم

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەکى ضەعيف و لاوازە، هەروەك ئيمام أبو حاتم الرازي و الدارقطني و شيخ عبدالله بن عبد الرحمن السعد و خالد الحايك و مصطفى العدوي و چەندانى تر باسيان کردووە و بە ضەعيف و لاوازيان داناوە، هەموو ڕيوايەتەکانى ئەم فەرموودەيە ضەعيف و لاوازن

# فەرمووده لاوازەکان ١٠٨

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( إِقْرَءُوا ( يس ) عَلَى مَوْتَاكُمْ ) أبو داود، وابن ماجة

واتا // سورەتی یاسین بخوێنن لەسەر مردووەکانتان

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام الدارالقطني و النووي و الذهبي و خالد الحايك و سليمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي و مصطفى العدوي و ابن باز و چەندانی تر باسیان کردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

# فەرمووده لاوازەكان ١٠٩

پرسيار // ئەيا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

( إِنَّ لِكُلِّ شَيْءٍ قَلْبًا، وَقَلْبُ الْقُرْآنِ يس، وَمَنْ قَرَأَ يس كَتَبَ اللَّهُ لَهُ بِقِرَاءَتِهَا قِرَاءَةَ الْقُرْآنِ عَشْرَ مَرَّاتٍ ) رواه الترمذي و الدارمي

واتا // هەموو شتێك دڵ و ناوەرۆكێكی هەیە، دڵی قورئانیش سورەتی (یس)ە هەركەسێک بیخوێنێ، وەک ئەوە وایە دەجار دەوری قورئانی كردبێتەوە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی ضەعیف و لاوازە، هەروەك ابن حجر و خالد الحايك و عبد العزيز الطريفي مصطفى العدوي و ابن باز و چەندانی تر باسیان كردووەو بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

- بەڕێزەكانم سورەتی یاسین هیچ فەرموودەیەكی صەحیح و ڕاستی لەسەر نەهاتووە لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، هەروەك زۆربەی زانایان باسیان كردووە، جا بۆیە گەورەیی سورەتی یاسین وەكوو هەموو سورەتەكانی تری قورئانە

# فەرموودە لاوازەكان ژمارە ١١٠

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە و ڕاستە ؟

( اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي رَجَبٍ، وَشَعْبَانَ، وَبَلِّغْنَا رَمَضَانَ ) رواهُ أحمد والطبراني

واتا // ئەی اللَّهُ تَعَالَی پیت و بەرەكەت بخەیتە مانگی ڕەجەب و شەعبان بۆمان، وەبشمان گەیەنی بەمانگی ڕەمەزان

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی زۆر زۆر ضەعیف و لاوازە، هەروەك ئیمام بخاري و أبو حاتم الرازي و ابن حبان و ابن معين و ابن عدي و طبراني وأبو داود والنسائي و ابن رجب الحنبلي والذهبي و الدارقطني و خالد الحايك و عبد العزيز الطريفي و سليمان بن ناصر العلوان و مصطفى العدوي و چەندانی تر باسیان كردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە، واللَّهُ أَعْلَم باوەڕ ناكەم هیچ زانایەك ئەم فەرموودەیەی بە صەحیح دانابێت

- كەوابوو زانیمان دوعای( اللَّهُمَّ بَلِّغْنَا رَمَضَانَ) هەموو زانایان بە ضەعیف و لاوازیان داناوە،، بەڵام دروستە كەسێك ئەم دوعایە بكات، بەس نەڵێت ئەمە فەرموودەی خۆشەویستە صَلَّی اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ١١١

پرسیار // ئایا ئەم فەرمودەیە صەحیحە ؟

مَنْ جَلَسَ فِي مَجْلِسٍ، فَكَثُرَ فِيهِ لَغَطُهُ، فَقَالَ قَبْلَ أَنْ يَقُومَ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ( سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ) إِلَّا غُفِرَ لَهُ مَا كَانَ فِي مَجْلِسِهِ ذَلِكَ

(رواه التِّرْمِذي و أبو داود والنسائي و أحمد)

واتا // هەركەسێك دانیشت لە مەجلیسێك جا هات و هاوار و گوناح و تاوانی زۆر تێدابوو مەجلیسەكە، جاپێش ئەوەی لە مەجلیسەكە هەستا وتی (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ) ئیللا اللَّهُ تَعَالَى لێی خۆش دەبێت لەو هەڵانەی لەو مەجلیسەدا ڕووی داوە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی ضەعیف و لاوازە، هەروەك ئیمام أحمد و بخاري و مسلم و أبو حاتم و أبو زرعة و الدارقطني وخالد الحايك و عبدالعزيز الطريفي و مصطفى العدوي و چەندانی تریش باسیان كردووەو بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

- بەڵام ئەگەر كەسێك ویستی ئەم دوعایە بكات ئەوە ئاساییە، لەهەندێ لە پیاو چاكان هاتووەو كردوویانە

## فەرموودە لاوازەكان ژمارە ١١٢

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە لەسەر خوێندنی سورەتی كەهف لە ڕۆژی هەينی دا صەحيحە ؟

(مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَضاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ ما بَيْنَ الجُمُعَتَيْنِ) السنن الكبرى للبيهقي

واتا // هەركەسێك لە ڕۆژی هەينی دا سورەتی(كەهف)ی خوێند، اللَّهُ تَعَالَی نێوان دوو هەينی بۆ ڕوناك دەكاتەوە

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكی ضەعيف و لاوازە،هيچ فەرموودەيەكی صەحيح نەهاتووە لە پێغەمبەرەوە لەسەر خوێندنی سورەتی كەهف لەشەو و ڕۆژی جومعەدا، هەروەک ئيمام ئەحمەد و نسائي و خالد الحايك و أبو علي الحارث الحسني و سليمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي و مصطفى العدوي و ابن باز و أبو إسحاق الحويني باسيان كردووە و بە ضەعيف و لاوازيان داناوە

پرسيار // ئايا ئەمەشيان ضەعيف و لاوازە لەسەر خوێندنی سورەتی كەهف ؟

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ (مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، أَضَاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ فِيمَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ الْعَتِيقِ) سنن الدارمي

وەڵام // پێش هەموو شتێک ئەمە فەرموودەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نییە، بەڵکو وتەی أبو سەعیدی خودرییە، لەپاشان ئەمەشیان قسەی لەسەرە ئیمام ئەحمەد و خالد الحايك و هەندێک لە زانایان بە ضەعیف و لاوازیان داناوە، وە هەندێک لەزانایان دەفەرموون ئەم فەرمودەیەی أبو سەعیدی خودری صەحیحە بەبێ ئەوەی تایبەت بکرێت بەشەو و ڕۆژی هەینی دا، واتا لەهەر ڕۆژێکی هەفتەدا خوێندتەوە ئەوە ئەو پاداشتەی باس کراوە بەدەستی دەهێنیت

- تەنها ئەم فەرموودەیە صەحیحە دەربارەی گەورەیی سورەتی کەهف لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

(مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ عُصِمَ مِنَ الدَّجَّالِ) رواهُ مُسْلِمٌ

واتا // هەرکەسێك دە ئایەتی سەرەتای سورەتی کەهفی لەبەر کرد دەپارێزێت لە فیتنەی دەججال

ئەمەش فەزڵ و گەورەیی سورەتی کەهف بەڵام پەیوەندی بە خوێندنی شەو و ڕۆژی هەینییەوە نییە، پەیوەندی بە فیتنەی دەججالەوە هەیە، بارك الله فيكم

## فەرموودە لاوازەکان ژمارە ١١٣

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

(مَا مِنِ امْرِئٍ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ ثُمَّ يَنْسَاهُ، إِلَّا لَقِيَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَجْذَمَ) رواه أبو داود

واتا // هیچ کەسێک نییە قورئان بخوێنێتەوە لەپاشان لەبیری بکات ئیللا دەگات بە اللَّهُ تَعَالَى لەڕۆژی قیامەتدا بەبەڵگە بڕاوی و دەست بڕاوی {واتا هیچ بەڵگەیەکی نییە بۆ ئەو کارەی کە ئەنجامی داوە }

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک، منذري وعبد الرحمن بن أبي حاتم و سليمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي و مصطفى العدوي و ابن باز و زۆری تریش باسیان کردووەو بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ١١٤

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه ؟

( وَعُرِضَتْ عَلَيَّ ذُنُوبُ أُمَّتِي، فَلَمْ أَرَ ذَنْبًا أَعْظَمَ مِنْ سُورَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ أَوْ آيَةٍ أُوتِيهَا رَجُلٌ ثُمَّ نَسِيَهَا ) رواهُ التِّرْمِذي و أبو داود

واتا // گوناح و تاوانی ئوممەتەكەم پێ نيشان درا نەمبينی گوناهێک گەورەتر بێت لەگوناهی ئەو كەسەی سورەتێكی فێربوبێت يان ئايەتێک لەپاشان لەبيری بچێتەوە

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكی ضەعيف و لاوازە، هەروەك ئيمام بخاري وترمذی و علي بن المديني و سليمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي و مصطفى العدوي و ابن باز وە چەندانی تريش باسيان كردووەو بە ضەعيف و لاوازيان داناوە

- خوشك و برايانم هيچ فەرموودەيەكی صەحيح و ڕاست نەهاتووە لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەسەر گوناهی ئەو كەسانەی قورئان دەزانن و لە پاشان لە بيری دەكەن، جا بۆيە كەس فێڵ لەخۆی نەكات بڵێت بۆيە قورئان لەبەر ناكەم دەترسم لەبيرم بچێتەوە

## فەرمووده لاوازەکان ژماره ١١٥

پرسیار // ئایا ئەم فەرمودەیە صەحیحە ؟

(سَيَأْتِي عَلَى النَّاسِ سَنَوَاتٌ خَدَّاعَاتُ، يُصَدَّقُ فِيهَا الْكَاذِبُ، وَيُكَذَّبُ فِيهَا الصَّادِقُ، وَيُؤْتَمَنُ فِيهَا الْخَائِنُ، وَيُخَوَّنُ فِيهَا الأَمِينُ، وَيَنْطِقُ فِيهَا الرُّوَيْبِضَةُ، قِيلَ : وَمَا الرُّوَيْبِضَةُ ؟ قَالَ، الرَّجُلُ التَّافِهُ فِي أَمْرِ الْعَامَّةِ) رواهُ ابن ماجة، وأحمد

واتا //ساڵانێکی هەڵخەڵەتێنەر دێت بەسەر خەڵکی دا، درۆزن بە ڕاستگۆ دادەنرێت، ڕاستگۆ بە درۆزن دادەنرێت، ناپاك بە ئەمین دادەنرێت، ئەمین بە ناپاك دادەنرێت، وە ڕووەیبیضە قسەی تێدا دەکات، وترا ڕووەیبیضە کێیە، فەرمووی پیاوێکی کەم و نەزانە قسە لەسەر کاری گشتی دەکات، (قسە بۆ کۆمەڵگا دەکات)

وەڵام //نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە، هەروەك ئیمام بخاري و أبو حاتم الرازي و أبو زرعة و نسائي و الدارقطني و ابن قدامة، خالد الحايك و سليمان بن ناصر العلوان و مصطفى العدوي و چەندانی تریش باسیان کردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

- ڕوون کردنەوە بێگومان واتای فەرموودەکە زۆر تەواوە، نابینن چۆن کەسی ڕاستگۆی حەق بێژ بە ناپاك دادەنرێت و دەیگرن،وە کەسی خۆ فرۆشی ناپاکی درۆزنیش بە ئەمین و ڕاستگۆ دادەنرێت و ڕێزی دەگرن.... هتد

# فەرمووده لاوازەکان ژماره ١١٦

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه ؟

( الْخَوَارِجُ كِلَابُ النَّارِ ) رواهُ التِّرْمِذي وابن ماجة و أحمد

واتا // خەواريج سەگى ناو ئاگرى دۆزەخن

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەکى ضەعيف و لاوازه، هەروەك ئيمام شعبة و أبو حاتم الرازي ونسائي والدارقطني وخالد الحايك و مصطفى العدوي وأبو علي الحارث الحسني وه چەندانى تريش باسيان کردووه و به ضەعيف و لاوازيان داناوه

- جا سُبْحَانَ اللَّه کەسانێک که ترسى اللَّهُ تَعَالَى لەدڵيان دا نييه، ئەم فەرمودەيه لەسەر موجاهيدان جێ بەجێ دەکەن و بەسەگى ناو ئاگر ناويان دەبەن، لا حول ولا قوة الا بالله

قَالَ اللَّهُ تَعَالَى ((وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا)) سورة الإسراء(٣٦)

## فەرموودە لاوازەکان ژمارە ١١٧

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە کەباسی ئاڵا ڕەشەکان دەکات ؟

( تَخْرُجُ مِنْ خُرَاسَانَ رَايَاتٌ سُودٌ، لَا يَرُدُّهَا شَيْءٌ حَتَّى تُنْصَبَ بِإِيلِيَاءَ) رواهُ التِّرْمِذي و أحمد

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە، هیچ فەرموودەیەکی صەحیح و ڕاستمان نییە نە لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نە لە صەحابەوە دەربارەی ئاڵا ڕەشەکان، هەروەك ئیمام أحمد و أبو زرعة و أبو حاتم الرازي و يحيى بن معين و نسائي و أبو داود وابن عدي و ابن حبان و بیهقي و ترمذي و ابن حجر و عبد الله بن عبد الرحمن السعد و خالد الحايك و سليمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي و مصطفى العدوي باسیان کردووە

اللَّهُمَّ انْصُرِ الْمُجَاهِدِينَ فِي كُلِّ مَكَانٍ

## فەرمووده لاوازەکان ژماره ١١٨

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( لَا تُؤْذِي امْرَأَةٌ زَوْجَهَا فِي الدُّنْيَا إِلَّا قَالَتْ زَوْجَتُهُ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ : لَا تُؤْذِيهِ قَاتَلَكِ اللَّهُ، فَإِنَّمَا هُوَ عِنْدَكَ دَخِيلٌ يُوشِكُ أَنْ يُفَارِقَكِ إِلَيْنَا)رواهُ التِّرْمِذي و ابن ماجة و أحمد

واتا // هەر ئافرەتێک مێردی خۆی ئەزیەت بدات لە دونیادا ئیللا ژنە حۆرییە چاوگەشەکەی ئەم پیاوە دەڵێت ئەزیەتی مەدە الله بتکوژێت، ئەو پیاوە میوانە لەلات، نزیکە لێت جودا بێتەوەو بگەڕێتەوە بۆ لای ئێمە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە، هەروەك ئیمام أبو نعيم وأبو حاتم و أبو زرعة و الترمذي والنسائي و ابن حبان وخالد الحايك و مصطفى العدوي و أبو علي الحارث الحسني و چەندانی تریش باسیان کردووەو بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

سُبْحَانَ اللَّهِ ئەو فەرموودانەی چەند ساڵە خێزانەکانمان پێی ڕاگرتوونەو دڵی خۆمانی پێ دەدەینەوە زۆربەی ضەعیف و لاواز دەرچوون

# فەرمووده لاوازەکان ژماره ١١٩

پرسیار // ئایا ئەم فەرمودەیە صەحیحە؟

(مَنْ صَلَّى الْغَدَاةَ فِي جَمَاعَةٍ، ثُمَّ قَعَدَ يَذْكُرُ اللَّهَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَانَتْ لَهُ كَأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ) رواهُ التِّرْمِذي

واتا // هەرکەسێک نوێژی بەیانی بەجەماعەت کرد، لەپاشان دانیشت ذکرو یادی اللّٰهُ تَعَالَی بکات هەتا ڕۆژهەڵدێت، لەپاشان دوو ڕکات نوێژ بکات، ئەوا پاداشتی حەج و عومرەیەکی تەواو تەواو تەواوی بۆ هەیە

وەڵام //نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە، هەروەك ئیمام البخاري و الترمذي و ابن معين و أبو حاتم الرازي ونسائي و ابن حبان و ابن عدي و خالد الحايك و مصطفى العدوي و سليمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي باسیان کردووه و بە ضەعیف و لاوازیان داناوه

# فەرمووده لاوازەكان ژمارە ١٢٠

پرسيار // ئايا فەرموودەى (صَلَاةُ التَّسْبيح) صە حيحە و ڕاستە ؟؟

وە لاٌم // نەخێر فەرموودەيەكى زۆر زۆر ضەعيف و لاوازە، بەڵكو (ابن الجوزي و ابن دحية الكلبي) بە مەوضوع و هەڵبەستراويان داناوە،، وە ئيمام أحمد والترمذي والعقيلي و ابن المديني وابن العربي وابن تيمية وابن عبدالهادي وسراج الدين القزويني والشوكاني و خالد الحايك و ابن باز و عبد الله بن عبد الرحمن السعد و مصطفى العدوي و عبد العزيز الطريفي باسيان كردووە و بە ضەعيف و لاوازيان داناوە

- ئەم نوێژە مەلايەكان زياتر لە مزگەوت ئەنجامى دەدەن وە بە جەماعەت دەيكەن وە لەمانگى ڕەمەزاندا دەيكەن ،، بەلاٌم پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەيكردووە، هيچ صەحابەيەكيش نەيكردووە، وە ئيمام مالك و ئيمام شافعي و ئيمام ئەحمەد و أبو حەنيفەش نەيان كردووە،، بۆيە ئێوەش مە يكەن

## فەرمووده لاوازەکان ژماره ١٢١

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه ڕاسته وتەی پێغەمبەره صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟؟

( لَوْ وُزِنَ إِيمَانُ أَبِي بَكْرٍ بِإِيمَانِ أَهْلِ الْأَرْضِ لَرَجَحَ بِهِمْ )

واتا // ئەگەر ئيمانی أبو بكر الصديق بکێشرێت به ئيمانی هەموو خەڵکی سەر زەوی ئەوا ئيمانی أبو بكر الصديق گرانتره له هی هەموويان

وەڵام // نەخێر ئەمه فەرموودەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نييه،

بەڵکو ئەمه وتەی (ئيمام عومەره) رضِيَ اللهُ عَنْهُ هەروەکو أبو حاتم الرازي والعقيلي وابن عدي و ابن عساكر و عبد العزيز الطريفي ومصطفى العدوي و چەندانی تريش باسيان کردووه

# فەرموودە لاوازەكان ژمارە ١٢٢

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟؟

( الْقَبْرُ رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ أَوْ حُفْرَةٌ مِنْ حُفَرِ النَّارِ ) رواهُ التِّرْمِذي

واتا // گۆڕ یان باخێكە لە باخەكانی بەهەشت، یان دۆڵێكە لە دۆڵەكانی دۆزەخ

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی زۆر ضەعیف و لاوازە، هەروەك ئیمام الترمذي و النسائي و أبو زرعة و مصطفى العدوي وە چەندانی تر باسیان كردووە و بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

- بەڵام ئەو فەرموودەیە صەحیحە، هەموو ئەو كەسانەی دەمرن بەیانیان و ئێواران ئەو شوێنە دەبینن كە لە قیامەتدا بۆیان ئامادەكراوە جا ئەهلی بەهەشت بێت یان ئەهلی دۆزەخ بێت اللَّهُ تَعَالَى بمان پارێزێت

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

( إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا مَاتَ عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَمِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٢٣

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

(كُلُّ ابْنِ آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ) رواه الترمذي و ابن ماجة و أحمد

واتاى فەرموودەكە // هەموو نەوەى ئادەم عليه السلام هەڵە دەكەن و گوناح دەكەن، وە باشترينى هەڵەكاران و گوناح بارانيش تەوبەكارانن

وەڵام // نەخێر ئەم فەرموودەيە ضەعيف و لاوازە، هەروەك ئيمام أحمد و البخارى و الترمذي والذهبي و ابن حبان و النسائي و أبو داود و سليمان بن ناصر العلوان و خالد الحايك و مصطفى العدوي و چە ندانى تريش باسيان كردووە و بەضەعيف و لاوازيان داناوە

- لەگەڵ وەشدا گومانمان نييە لەوەى هەموو كەسێك توشى هەڵەو تاوان دەبێت و باشترين گوناح بارانيش ئەو كەسانەن تەوبەيەكى جوان و چاك دەكەن

# فەرمووده لاوازەكان ژمارە ١٢٤

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، أَوْ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ إِلَّا وَقَاهُ اللَّهُ فِتْنَةَ الْقَبْرِ ) رواه الترمذي و أحمد

واتای فەرموودەكە // هیچ مسوڵمانێك نییە بمرێت لە ڕۆژی هەینی یان لەشەوی هەینی ئیللا اللَّهُ تَعَالَى دەیپارێزێت لە فیتنە و سزای گۆڕ و قەبر

وەڵام // نەخێر ئەم فەرموودەیە زۆر ضەعیف و لاوازە ، هەروەك ئیمام البخاري و الترمذي و ابن حجر و سلیمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي و ابن باز و مصطفى العدوي و خالد الحايك و أبو علي الحارث الحسني باسیان كردووە و بە ضەعیف لاوازیان داناوە

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٢٥

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه ؟

( إِنَّ أُمَّتِي لَا تَجْتَمِعُ عَلَى ضَلَالَةٍ )رواه ابن ماجة

واتا // بێگومان ئوممەتەكەم لەسەر گومڕايی كۆ نابنەوه

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكی ضەعيف و لاوازه هەروەک ابن حجر و ابن كثير و والنووي و السندي و سليمان بن ناصر العلوان و أبو علي الحارث الحسني وه چەندانی تر باسيان كردووه و به ضەعيف و لاوازيان داناوه

قَالَ ابْنُ حَجَرٍ فِي التَّلْخِيصِ: قَوْلُهُ وَأُمَّتُهُ مَعْصُومَةٌ لَا تَجْتَمِعُ عَلَى الضَّلَالَةِ هَذَا فِي حَدِيثٍ مَشْهُورٍ لَهُ طُرُقٌ كَثِيرَةٌ لَا يَخْلُو وَاحِدٌ مِنْهَا مِنْ مَقَالٍ (تحفة الأحوذي للمباركفوري)

قال النووي

وَأَمَّا حَدِيث لَا تَجْتَمِع أُمَّتِي عَلَى ضَلَالَة فَضَعِيف. وَاللَّهُ أَعْلَم(شرح صحيح مسلم للنووي)

# فەرموودە لاوازەکان ژمارە ١٢٦

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( يُدْعَى النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأُمَّهاتِهِمْ ) أخرجه الطبراني

واتا // خەڵکی بانگ دەکرێن لە ڕۆژی قیامەتدا بەناوی دایکیان

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی زۆر زۆر ضەعیف و لاوازە یان مەوضوع و هەڵبەستراوە و درۆیە هەروەک البخاري و ابن عدي وابن القيم وابن بطال و ابن حجر وأبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي و ابن باز و عبد العزيز الطريفي وە زۆر لە زانایانی تریش باسیان کردووە

- بەڵکو خەڵکی لە قیامەت دا بەناوی باوکیان بانگ دەکرێن هەروەک ئیمام بوخاری دەفەرموێت لە صەحیحەکەی دا ( بَابُ مَا يُدْعَى النَّاسُ بِآبَائِهِمْ ) ئینجا فەرموودەی صەحیح دەهێنێتەوە کەوا خەڵکی بە ناوی باوکیان بانگ دەکرێن

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

( الْغَادِرُ يُرْفَعُ لَهُ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يُقَالُ : هَذِهِ غَدْرَةُ فُلَانِ بْنِ فُلَانٍ ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ و اللفظ للبخاري

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٢٧

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه ؟

( إِنَّكُمْ تُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَسْمَائِكُمْ وَأَسْمَاءِ آبَائِكُمْ فَأَحْسِنُوا أَسْمَاءَكُمْ ) رواه أبو داود و الدارمي و أحمد

واتا // بێگوومان ئێوه له ڕۆژی قيامەتدا بەناوی خۆتان وه بەناوی باوكتان بانگ دەكرێن جا ناوی خۆتان جوان و چاک بكەم { ناوی خۆش و جوان لەخۆتان بنێن)

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكی ضەعيف و لاوازه و پچڕان هەيه له سەنەدەكەدا هەروەک ئيمام أبو داود وأبو حاتم الرازي و أبو زرعة الرازي و البيهقي و المنذري و عبد العزيز الطريفي و چەندانی تر باسيان كردووه و به ضەعيف و لاوازيان داناوه

عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي زَكَرِيَّاءَ نەبيستووه له أَبُو الدَّرْدَاءِ بۆيه فەرموودەيەكی ضەعيف و لاوازه

- بەڵام هەروەک باسم كرد له فەرموودەی ١٢٦ خەڵكی له قيامەت دا بەناوی باوكيان بانگ دەكرێن نەک بەناوی دايكيان

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٢٨

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه ؟

( رَحِمَ اللَّهُ امْرَأً صَلَّى قَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعًا ) سنن أبي داود والترمذي وأحمد

واتا // ڕەحمەتى اللَّهُ تَعَالَى لەو كەسه بێت چوار ڕكات نوێژى سوننەت دەكات له پێش نوێژى عەسر

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكى ضەعيف و لاوازه هەروەک ئيمام أبو حاتم الرازي و أبو زرعة و بن القطان و عبدالله بن عبدالرحمن السعد و أبو علي الحارث الحسني و سليمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي و مصطفى العدوي وە زۆرێكى تر باسيان كردووه و بەضەعيف لاوازيان داناوه

بەڵام فەرموودەيەكمان هەيه رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموويەتى ( بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ - ثَلَاثًا - لِمَنْ شَاءَ ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

أَذَانَيْنِ = بانگ و قامەت

## فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٢٩

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

( نَوْمُ الصَّائِمِ عِبادَةٌ ، وصُمْتُهُ تَسْبيحٌ ، ودُعاؤُهُ مُسْتَجابٌ ، وعَمَلُهُ مُضاعَفٌ) رواه البيهقي في "شعب الإيمان

واتا //خەوتنی ڕۆژووگر پەرستن و عیبادەتە، وە بێدەنگ بوونی سبحان الله یە، وە پاڕانەوەکەشی قەبوڵە، وە کردەوەکانیشی چەندقاتە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی زۆر ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أحمد، البخاري، أبو حاتم الرازي، النسائي، أبو داود، الدارقطني، ،خالد الحايك،عبدالله بن الرحمن سعد، البيهقي، المناوي، الحافظ العراقي، السيوطي، وە زۆر لە زانایانی تریش باسیان کردووەو بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

## فەرمووده لاوازەکان ژماره ١٣٠

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

( أَوَّلُ شَهْرِ رَمَضَانَ رَحْمَةٌ، وأَوْسَطُهُ مَغْفِرَةٌ ، وآخِرُهُ عِتْقٌ مِنَ النَّارِ )
رواه ابن خزيمة

واتا // سەرەتای مانگی ڕەمەزان ڕەحمەتە ، وەناوەڕاستەکەشی لێخۆشبوونە ،وە کۆتایەکەشی ئازاد بوونە لە دۆزەخ

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە، هەروەك ئیمام أحمد، ابن معين، النسائي، ابن خزيمة، أبو حاتم الرازي، العقيلي، الخطيب البغدادي، ابن حجر، ابن عدي، ابن باز، مصطفى العدوي، وە چەندانی تر باسیان کردووە بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

## فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٣١

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە كە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەبۆنەی هاتنی ڕەمەزان پیرۆزبایی كردبێت لە صەحابەكان ؟

( أَتَاكُمْ رَمَضَانُ شَهْرٌ مُبَارَكٌ، فَرَضَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَيْكُمْ صِيَامَهُ، تُفْتَحُ فِيهِ أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَتُغْلَقُ فِيهِ أَبْوَابُ الْجَحِيمِ، وَتُغَلُّ فِيهِ مَرَدَةُ الشَّيَاطِينِ، لِلَّهِ فِيهِ لَيْلَةٌ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ، مَنْ حُرِمَ خَيْرَهَا فَقَدْ حُرِمَ ) رواه النسائي، وأحمد

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەكی ضەعیف و لاوازە هەروەک، المنذري، ابن حجر، الدمياطي، العلائي، خالد الحايك، عبدالله بن عبدالرحمن السعد ،وأبو علي الحارث الحسني و كۆمەڵێكی تر لە زانایان دەفەرموون ضەعیف و لاوازە، هیچ فەرموودەیەكی صەحیح نەهاتووە لەم بارەیەوە

ئەم فەرموودەیە لەسەنەدەكەی دا پچڕان هەیە چونكە أَبُـو قِلَابَةَ لە أَبُـو هُرَيْرَةَ ی نەبیستووە بۆیە فەرموودەیەكی مونقەتیعە

- بەڵام دروستە پیرۆزبایی لەیەک كردن بە بۆنەی هاتنی مانگی ڕەمەزان وەكوو عورف و عادەت نەک وەكوو سوننەت و عیبادەت چونكە سوننەت و عیبادەت نییە، هەروەك زانایان باسیان لێوە كردووە

## فەرموودە لاوازەکان ژمارە ١٣٢

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە و ڕاستە، ئەگەر چوویە بازاڕ ئەو زیکر و دوعایەی بکەی؟

(لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ حَيٌّ لَا يَمُوتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) رواهُ الترمذي

وەڵام / نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أبو حاتم الرازي و الدارالقطني و النسائي و أبو زرعة الرازي و الترمذي و الدارمي وابن القيم وابن عدي والعقيلي و سليمان بن ناصر العلوان و مصطفى العدوي و ابن باز و عبد العزيز الطريفي و أبو علي الحارث الحسني وە زۆرێکی تریش باسیان کردووە و بەضەعیف لاوازیان داناوە

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٣٣

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه ؟

(اللَّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي)
رواهُ ابْنُ مَاجَة و الترمذي و أحمد

واتا //ئەى اللَّهُ تَعَالَى ئەتو لێبوردەى، لێبووردنيشت خۆش دەوێت، بۆيه لێم ببوره

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكى ضەعيف و لاوازه، هەروەك شێخ خالد الحايك و عبد الله بن عبد الرحمن السعد و سليمان بن ناصر العلوان و مصطفى العدوي و عبد العزيز الطريفي و أبو علي الحارث الحسني باسيان كردووه و بەضەعيف لاوازيان داناوه بەڵكو ئەمه وتەى دايه عائيشه يه رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا

- دەتوانى وەكو دوعا بيكەى چونكه دوعايەكى زۆر جوان و چاكه

# فەرموودە لاوازەکان ژمارە ١٣٤

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ { أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُخَلِّلُ لِحْيَتَهُ } رواهُ التِّرْمِذي و ابن خزيمة

واتا // لە عوسمانی کوڕی عەففانەوە { پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەستی دەهاویشتە ڕیشیەوەو ئاوی پێدا دەکرد } لەکاتی دەست نوێژدا }

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أحمد بن حنبل و يحيى بن معين وأبو حاتم الرازي وخالد الحايك و عبد الله بن عبد الرحمن السعد و أبو علي الحارث الحسني و سليمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي و مصطفى العدوي و چەندانی تریش باسیان کردووە و بەضەعیف لاوازیان داناوە

وَضَعَّفَ الحَديثَ وَأَنْكَرَهُ إِبْنُ مَعِين

وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ و أَبُو حاتِمِ الرَّازي { لَا يَثْبُتُ فِي تَخْلِيلِ اللِّحْيَةِ حَدِيثٌ}

- دەی ئەم فەرموودەیە فەرموودەیەکی حەسەنە لەلای پێشەوا بوخاری وە ضەعیف و لاوازە لەلای پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل با ئەبو موحەممەدی سنەیی بەقسەی بوخاری بکات مادام مسوڵمانە بۆ بەقسەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەکات کەپێی

دەسێکی کافرە لەپاشان ئەبو موحەممەدی سنەیی جگە لە فەرموودەکانی موسلیم و بوخاری هەموو ئەوانی تری پێ ضەعیف و لاوازە، کەچی خودی پێشەوا موسلیم و پێشەوا بوخاری وا نەبوونە بەهیچ شێوەیەک، پێم ناڵێن ئەو کافرە شوێن کەوتەی کێیە

-هیچ فەرموودەیەکی صەحیح نەهاتووە لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەم بارەیەوە بەڵام لەچەندین صەحابەوە هاتووە بە صەحیحی وەکوو ابن عمر و أبو موسى وابن عباس و أنس

پرسیار // ئایا دەست تێوەردان و ئاو پێدا کردنی ڕیش واجبە یان سوننەتە لەدەست نوێژدا ؟

وەڵام // ئەگەر ڕیشەکە تەنک بوو بەشێوەک پێستەکە بەدیار دەکەوت ئەوە واجبە ڕیشت بشۆیو وە ئاو بنێیتە پێستەوە ، ئەگەر ڕیشەکە پڕ و زۆر بوو ئەوە بەس دەرەوەی ڕیش واجبە ئەوەی تر سوننەتە

بەڵام لەکاتی خۆشۆرین سەر و بنی ڕیش واجبە تەرکرێت جا ڕیشەکە کەم بێت یان زۆر بێت بارك الله فيكم

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٣٥

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه ؟

( الْكَيِّسُ مَنْ دَانَ نَفْسَهُ وَعَمِلَ لِمَا بَعْدَ الْمَوْتِ، وَالْعَاجِزُ مَنْ أَتْبَعَ نَفْسَهُ هَوَاهَا، وَتَمَنَّى عَلَى اللَّهِ ) رواهُ التِّرْمِذي و ابن ماجة و أحمد و الحاكم

واتا // كەسى زيرەک ئەو كەسەيه سەرزەنشتى خۆى دەكات وە كردەوەى چاک دەكات بۆ قيامەتى خۆى، وە كەسى لاواز و بێ توانا ئەو كەسەيه نەفسى شوێن كەوتەى هەواو ئارەزووى خۆى دەكات وە كردوەى چاک ناكات و خۆزگە دەخوازێت لەسەر اللَّهُ تَعَالَى

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكى ضەعيف و لاوازە هەروەک ئيمام أحمد و يحيى بن معين و أبو حاتم الرازي و أبو زرعة الرازي و النسائي و الدارالقطني و ابن عدي و الذهبي و ابن حجر و سليمان بن ناصر العلوان و ماهر الفحل و مصطفى العدوي وە چەندانى تر باسيان كردووە و بە ضەعيف و لاوازيان داناوە

- لەسەنەدى ئەو فەرموودەيه دا { أَبُـو بَكْرِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ } ى تێدايه زانايان قسەيان كردووە لەسەر فەرموودەكانى

قال أبو حاتم الرازي سألت يحيى بن معين عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ فضعفه

قال الدوري عنه ليس حديثه بشيء

أبو حاتم الرازي : ضعيف الحديث

أبُو زرعة الرازي : ضعيف الحديث، منكر الحديث

أحمد بن حنبل : ضعيف الحديث

قالَ النسائي في الضعفاء : ضعيف

الدارقطني : ضعيف

قالَ إبنُ حبان : كان رديء الحفظ يحدث بالشيء ويهم فيه.....

قالَ الذهبي : في الكاشف ضعفوه

قال ابن حجر في تقريب التهذيب : ضعيف

أبو داود السجستاني : سرق له حلي فأنكر عقله

الجوزجاني : ليس بالقوي في الحديث

ولمَّا قالَ الحاكِمُ هذا حَديثٌ صَحيحٌ تَعَقَّبَهُ الذَّهبيُّ بِقَوْلِهِ : لا و اللَّهِ أَبُو بَكْرِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ واهٍ وقالَ عَنْهُ في مَوْضِعٍ آخَرَ مُجْمَعٌ على ضَعْفِهِ

# فەرمووده لاوازەکان ژماره ١٣٦

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه ؟

( إِذَا صَلَّتِ الْمَرْأَةُ خَمْسَهَا، وَصَامَتْ شَهْرَهَا، وَحَفِظَتْ فَرْجَهَا، وَأَطَاعَتْ زَوْجَهَا، قِيلَ لَهَا : ادْخُلِي الْجَنَّةَ مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ شِئْتِ ) مسند إمام أحمد

و هو حديث مضطرب و منقطع و منكر كما قال أبو علي الحارث الحسني

واتا // ئەگەر ئافرەت پێنج نوێژەکەی کرد و مانگی ڕەمەزانيش به ڕۆژوو بوو،وه داوێنی خۆی پاراست له خراپه، وه گوێڕايەڵ بوو بۆ مێردەکەی ، پێی دەوترێت بڕۆ بۆ بەهەشت لەهەر دەرگايێک دەتەوێت و پێت خوشه

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەکی ضەعيف و لاوازه، هەروەک ئيمام الطبراني و مصطفى العدوي و أبو علي الحسني و چەندانی تر باسيان کردووه و به ضەعيف و لاوازيان داناوه

ئەم فەرموودەيه بەچەند ڕيوايەتێک هاتووه هەرهەمووی ضەعيف و لاوازن هەروەک يحيى بن معين و طبراني و ئەوانی تريش قسەيان لەسەر کردووه

# فەرمووده لاوازەکان ژماره ۱۳۷

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیه صەحیحه ؟

عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ { مَرَّ بِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا مُضْطَجِعٌ عَلَى بَطْنِي، فَرَكَضَنِي بِرِجْلِهِ وَقَالَ : يَا جُنَيْدِبُ إِنَّمَا هَذِهِ ضِجْعَةُ أَهْلِ النَّارِ } رواه ابن ماجة و أحمد و الترمذي وأبو داود

واتا // ئەبو ذەر فەرمووی { پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەلام دا تێپەڕی و ئەمنیش لەسەر زگ پاڵ کەوتبووم جا بەپێی لێی دام وە فەرمووی ئەی جونەیدیب ئەو جۆره پاڵداناوەیه پاڵدانەوەی دۆزەخییەکانه

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام البخاري و أبو حاتم الرازي و الدارالقطني وأبو إسحاق إبراهيم الحربي و ابن رجب و أبو علي الحارث الحسني و خالد الحايك و سليمان بن ناصر العلوان و مصطفى العدوي و چەندانی تریش باسیان کردووه و بەضەعیف لاوازیان داناوه

- هیچ فەرموودەیەکی صەحیح نەهاتووە لەسەر قەدەغەکردنی نووستن لەسەر زگ، بۆیه دروسته نوستن لەسەر زگ، بەڵام نوستن بەلای ڕاستەدا چاکتره و سوننەته

## فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٣٨

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

(اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِلْمًا نَافِعًا، وَرِزْقًا طَيِّبًا، وَعَمَلًا مُتَقَبَّلًا) مسند أحمد، و ابن ماجة

واتا // ئەی اللَّهُ تَعَالَى ئەمن داوای زانستێکی بەسوودت لێ دەکەم، وە داوای ڕزقێکی پاک و حەلالت لێ دەکەم وە داوای کردەوەیەک قەبووڵ کراوت لێ دەکەم

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک سلیمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي و مصطفى العدوي و چەندانی تریش باسیان کردووە و بەضەعیف لاوازیان داناوە

## فەرموودە لاوازەکان ژمارە ١٣٩

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

(الفِتْنُةُ نائِمَةٌ لَعَنَ اللَّهُ مَنْ أَيْقَظَها)

واتا // فيتنە نوستييە نەفرەتى الله لەو كەسە بێت بە ئاگای دەهێنێت

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكى زۆر زۆر ضەعيف و لاوازە بە كۆدەنگى هەموو فەرموودەناسان هەروەک شيخ سليمان بن ناصر العلوان باسى كردووە وە مصطفى العدوي دەڵێت هەر ئەسڵ و ئەساسى نيە ئەو فەرموودەيە

- ئەگەرچى ئەمە فەرموودەى پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نيە بەڵام بێگومان فيتنە گێران تاوانێكى زۆر گەورەيە، اللَّهُ تَعَالَى بمان پارێزێت

## فەرمووده لاوازەکان ژماره ١٤٠

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیه صەحیحه ؟

{ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ حِينَ يُصْبِحُ عَشْرًا وَحِينَ يُمْسِي عَشْرًا أَدْرَكَتْهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ } رواهُ الطبراني

واتا // هەرکەسێک بەیانیان و ئێواران ده سەڵەواتم لەسەر لێ بدات ئەوه شەفاعەتی منی پێ دەگات

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی زۆر ضەعیف و لاوازه هەروەک ئیمام ابن القیم و الحافظ العراقي و السخاوي و أبو علي الحارث الحسني و سليمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي و خالد الحايك و عبدالله بن عبدالرحمن السعد و مصطفى العدوي وه چەندانی تر باسیان کردووه و به ضەعیف و لاوازیان داناوه

پرسیار // بۆ ئەو فەرموودەیه ضەعیف و لاوازه ؟؟

وەڵام // لەبەر چەند هۆکارێک یەکێک له هۆکارەکان ئەوەیه خالیدی کوڕی مەعدان گوێی له ئەبو دەردای نەبووه بۆیه فەرموودەیەکی مونقەطیعه

بێگومان سەڵەوات لێدان كارێكی زۆر زۆر چاكە و لە هەركاتێك دا صەڵەوات لێ بدەی ئەجر و پاداشتی خۆت وەردەگری

وە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی { مَنْ صَلَّى عَلَيَّ وَاحِدَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرًا } رواهُ مُسْلِمٌ

واتای فەرموودەكە // خۆشەویست صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی { هەركەسێك یەک سەڵەواتم لەسەر لێ بدات ئەوە اللَّهُ تَعَالَى دە سەڵەواتی لەسەر لێ دەدات }

## فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٤١

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

( إِلْتَمِسْ لِأَخِيكَ سَبْعِينَ عُذْراً )

واتا // حەفتا عوزر بهێنەوه بۆ برا مسوڵمانەكەت

وەڵام // نەخێر ئەم وتەيە فەرموودەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نيە بەڵكو وتەی ابن سيرين و جەعفەری كوڕی محمد و حمدون

چەند زانايێكی تره هەروەك شيخ خالد الحايك و ابن باز و مصطفى العدوي ڕونيان كردۆتە وه و باسيان كردووه

- به ڵام بێگومان عوزر هێنانە وه بۆ بەرامبەرەكەت كارێكی زۆر جوان و چاكە

## فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٤٢

پرسيار //ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه و ڕاسته سورة الرَّحْمَن بوكى قورئانه ؟

{ لكلِّ شَيءٍ عروسٌ ، و عروسُ القُرآنِ الرَّحمنُ } رَوَاهُ البيهقي

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكى يان زۆر زۆر ضەعيف و لاوازه يان هەر مەوضوع و هەڵبەستراوه و درۆيه لەو نێوانه دايه، بەهيچ شێوەيەك دروست نييه پاڵبدرێته لاى پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەروەك شيخ خالد الحايك و مصطفى العدوي و والحاصل به كۆدەنگى هەموو فەرموودەناسان ئەمه فەرموودەى پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نيه

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٤٣

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه و ڕاسته ؟؟

(طَلَبُ الْعِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ)
رواهُ ابْنُ مَاجَة

واتا // داوا كردنى زانست فەرزه لەسەر هەموو مسوڵمانێك

وەڵام // نەخێر ئەم فەرموودەيه ضەعيف و لاوازه، هەروەک ئيمام العقيلي و ابن عدي و والطبراني والدارقطني و البيهقي و ابن عبد البر و ابن صلاح و البزار و خالد الحايك و أبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي و أبو إسحاق الحويني و چەندانى تر باسيان كردووه و بەضەعيف لاوازيان داناوه

## فەرمووده لاوازەکان ژماره ١٤٤

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

(مَنْ أَفْطَرَ يَوْمًا مِنْ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ رُخْصَةٍ لَمْ يُجْزِهِ صِيَامُ الدَّهْرِ) رواهُ ابْنُ مَاجَة، و الترمذي

واتا // هەرکەسێك ڕۆژییەک لە مانگی ڕەمەزان بشکێنێت بەبێ عوزر و مۆڵەت ئەوا ئەگەر هەموو ساڵەکە بە ڕۆژی بێت جێی ئەو ڕۆژییە پڕ ناکاتەوە

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أحمد و أبو حاتم الرازي و البخاري والترمذي والدارقطني وخالد الحايك وسليمان بن ناصر العلوان وأبو علي الحارث الحسني وابن باز ومصطفى العدوي و زۆربەی زانایان باسیان کردووە،، بەڵکو ئەمە وتەی أبو هريرة یە وە قسەی إبن مسعودیشە

- بۆ زانیاریتان ابن تيمية و ابن القيم و ابن حزم دە فەرموون، ئەگەر کەسێك ڕۆژووەك بەبێ عوزر بشکێنێت بۆی نییە قەزای بکاتەوە و ڕۆژییەکە بگرێتەوە، چونکە چەندەها ساڵ بەڕۆژی بێت جێگەی ئەو ڕۆژییە ناگرێتەوە،، بۆیە دەفەرموون دەبێت تەوبە بکات لەو گوناهە گەورەیە

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٤٥

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

{ صِنْفَانِ مِنْ أُمَّتِي لَيْسَ لَهُمَا فِي الْإِسْلَامِ نَصِيبٌ : الْمُرْجِئَةُ وَالْقَدَرِيَّةُ } رواهُ التِّرْمِذي و ابن ماجة

واتا // دوو چين و پۆل هەنە لە ئوممەتەكەم هيچ بەشێكيان لە ئيسلامدا ئەوانيش مورجيئەكان و قەدەرييەكانن

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكی ضەعيف و لاوازە هەروەک ئيمام يحيى بن معين و ابن حبان و ابن عدي و المزي والذهبي وابن حجر و أبو فتح الأزدي و المباركفوري و الفيروزابادي و أبو علي الحارث الحسني و خالد الحايك و مصطفى العدوي و چەندانی تر باسيان كردووە و بە ضەعيف و لاوازيان داناوە

- هيچ فەرموودەيەكی صەحيح نەهاتووە دەربارەی مورجيئەكان و قەدەرييەكان و موعتەزيلەكان... لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٤٦

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه ؟

عَنْ أبي ذر : قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَمْ وَفَّى عِدَّةُ الْأَنْبِيَاءِ ؟ قَالَ ( مِائَةُ أَلْفٍ وَأَرْبَعَةٌ وَعِشْرُونَ أَلْفًا، الرُّسُلُ مِنْ ذَلِكَ ثَلَاثُمِائَةٍ وَخَمْسَةَ عَشَرَ ) مسند إمام أحمد و غيره

واتا // له ئەبو ذەرەوه دەڵێت وتم ئەى نێردراوى اللَّهُ تَعَالَى ژمارەى پێغەمبەران چەند دەبێت؟ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووى ١٢٤ هەزار پێغەمبەرن، ٣١٥ لەوان رەسول و نێردراون

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكى ضەعيف و لاوازە هەروەک ئيمام يحيى بن معين و أبو حاتم الرازي و الدارالقطني و النسائي و ابن الجوزي و سليمان بن ناصر العلوان و أبو علي الحارث الحسني وابن باز و شعيب الأرنؤود و مصطفى العدوي و چەندانى تريش باسيان كردووه و بەضەعيف لاوازيان داناوه

لەسەنەدى ئەو فەرموودەيه دا { مُعَانُ بْنُ رِفَاعَةَ } ى تێدايه زانايان قسەيان كردووه لەسەر فەرموودەكانى

- يحيى بن معين : ضعيف
- أبو حاتم الرازي : شيخ حمصى يكتب حديثه ولا يحتج به
- قال ابن حبان : منكر الحديث
- الجوزجاني : ليس بحجة

- ابن حجر العسقلاني في تقريب التهذيب لين الحديث كثير الإرسال
- أبو فتح الأزدي : لا يحتج به
- ابن عدي : عامة ما يرويه لا يتابع عليه

وە هەروەها لەسەنەدی ئەو فەرموودەیە دا ئەو پیاوەشی تێدایە { عَلِيُّ بْنُ يَزِيدَ } زۆربەی زانایان قسەیان لەسەر کردووە

- يحيى بن معين : ضعيف
- علي بن المديني : ضعيف
- البخاري : منكر الحديث
- أبو حاتم الرازي : ضعيف الحديث
- أبو زرعة الرازي : ليس بقوي
- النسائي : متروك الحديث
- الدارقطني : متروك
- أحمد بن حنبل : هو دمشقي كأنه ضعفه
- ابن حبان : منكر الحديث جداً
- الذهبي : ضعفه جماعة
- ابن حجر العسقلاني : ضعيف
- أبو فتح الأزدي : متروك
- البرقاني : منكر
- ابن يونس : فيه نظر
- أبو نعيم الأصبهاني : منكر الحديث
- الساجي : إتفق أهل العلم على ضعفه

هیچ فەرموودەیەکی صەحیح نەهاتووە لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە صەحیحی لەسەر ژمارەی پێغەمبەران

## فەرموودە لاوازەکان ژمارە ١٤٧

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە کاتێك لە ماڵ دەرچووی ئەم دوعایە بکەی ؟

(بِاسْمِ اللَّهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ) رواهُ التِّرْمِذي و أبو داود والنسائي

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە، هەروەك ئیمام البخاري و الدارقطني و خالد الحايك و سليمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي و مصطفى العدوي باسیان کردووەو بە ضەعیف و لاوازیان داناوە

لەسەنەدی ئەو فەرموودەیە دا { ابْنُ جُرَيْجٍ } ی تێدایە وە گوێی لە { إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ } ی نەبووە هەروەک پێشەوا بوخاری و زانایان باسیان کردووە،، بۆیە فەرموودەیەکی مونقەطیعە و ضەعیف و لاوازە

- بەڵام ئەگەر کەسێک ئەو زیکرەی کرد لەکاتی دەرچوون لەماڵ دا ئەوە کێشە نیە، بەس نەڵێت ئەمە فەرموودەی پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٤٨

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيه صەحيحه ؟

عَنِ الْحَسَنِ ، عَنْ سَمُرَةَ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ { مَنْ تَوَضَّأَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَبِهَا وَنِعْمَتْ، وَمَنِ اغْتَسَلَ فَالْغُسْلُ أَفْضَلُ } رَوَاهُ التِّرْمِذِي و أبو داود و النسائي و ابن ماجة و الدارمي و أحمد بن حنبل

واتا // هەركەسێك دەست نوێژى هەڵگرت لەڕۆژى جومعەدا ئەوە كارێكى چاكە و نيعمەتە، وە هەركەسێک خۆى شۆرى ئەوە خۆ شۆرين باشترە

وەڵام // نەخێر فەرموودەيەكى ضەعيف و لاوازە هەروەک ئيمام البخاري و الترمذي و النسائي و أبو علي الحارث الحسني و سليمان بن ناصر العلوان و عبد العزيز الطريفي و مصطفى العدوي و چەندانى تريش باسيان كردووە و بەضەعيف لاوازيان داناوە

- پێشەوا بوخارى و ترمذي دەفەرموون فەرموودەيەكى مورسەلە

- و قالَ النَّسائِيُّ { وَلَمْ يَسْمَعِ الْحَسَنُ مِنْ سَمُرَةَ إِلَّا حَدِيثَ الْعَقِيقَةِ }

پێشەوا نەسائى دەفەرموێت حەسەن هيچ فەرموودەيەكى نەبيستووە لە سەمورە جگە لە فەرموودەى عەقيقە

- خۆشۆرینی ڕۆژی هەینی واجبە و پێویستە ، چەندین فەرموودەی صەحیحی لەسەرە

قالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ { غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ { إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

## فەرموودە لاوازەکان ژمارە ١٤٩

پرسیار // ئایا ئەم فەرموودەیە صەحیحە ؟

{ مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَعُودُ مُسْلِمًا غُدْوَةً إِلَّا صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ، حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنْ عَادَهُ عَشِيَّةً إِلَّا صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ، حَتَّى يُصْبِحَ، وَكَانَ لَهُ خَرِيفٌ فِي الْجَنَّةِ } رَوَاهُ التِّرْمِذِي و أبو داود و ابن ماجة و أحمد

واتا // هیچ مسوڵمانێک نییە ئەگەر لەپێناو اللَّهُ تَعَالَى سەردانی مسوڵمانێکی نەخۆش بکات لە بەیانییەکەی ئەوە حەفتا هەزار مەلائیکەت داوای لێ خۆشبوون بۆ ئەو کەسە دەکەن هەتا ئێوارە ، وە ئەگەر ئێوارەکەی سەردانی کرد ئەوە حەفتا هەزار مەلائیکەت داوای لێ خۆشبوونی بۆ دەکەن هەتا بەیانیەکەی وە باغ و بێستانی بۆ هەیە لەبەهەشت

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی ضەعیف و لاوازە و پاڵنادرێت بۆلای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بەڵکو ئەمە ووتەی صەحابەی بەرێز عەلی کوڕی ئەبو تالیب بیە هەروەک ابن أبي شيبة و الترمذي وأبو داود و الطبراني و البزار و المنذري و أبو علي الحارث الحسني و مصطفى العدوي و چەندانی تریش باسیان کردووە

- وە لەسەنەدی ئەو فەرموودەیە دا { ثُوَيْرٌ ابْنُ أَبِي فَاخِتَةَ } ی تێدایە زۆربەی زانایان قسەیان لەسەر کردووە و فەرموودەکانی بە ضەعیف و لاواز دادەنێن وەکوو { يحيى بن سعيد القطان و ابن

مهدي و ابن معين والبخاري و الدوري وابن أبي خيثمة و أبو زرعة الرازي و أبو حاتم الرازي و النسائي و الدارالقطني و ابن حبان و الذهبي و ابن حجر و أبو داود السجستاني والجوزاني و العقيلي و ابن الجارود وبن عيينة وسفيان الثوري والبزار وه زۆرى تريش باسيان كردووه }

- هەروەك وتم ئەمە فەرموودەی پێشەوا عەلی كوڕی ئەبو تاليب بیه ، جا ئايا حوكمی ڕەفعی هەیە یان ناا ئەوەیان اللَّهُ تَعَالَى زاناتره ، بەڵام بێگومان سەردانی نەخۆش یان سەردانی كردن لە پێناو اللَّهُ تَعَالَى دا خێرێكی زۆر زۆر گەورەیە

# فەرمووده لاوازەكان ژماره ١٥٠

پرسيار // ئايا ئەم فەرموودەيە صەحيحە ؟

{ مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْوَاقِعَةِ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ لَمْ تُصِبْهُ فَاقَةٌ أَبَدًا } رواه أبو يعلى وابن مردويه والبيهقي في الشعب

واتا // هەر کەسێک سورەتی واقیعە بخوێنێتەوە لە هەموو شەوێک دا ئەوە هەرگیز تووشی هەژاری نابێت

وەڵام // نەخێر فەرموودەیەکی زۆر ضەعیف و لاوازە هەروەک ئیمام أحمد بن حنبل و أبو حاتم الرازي و ابنه و الدارالقطني و البيهقي و ابن الجوزي وعبد العزيز الطريفي و مصطفى العدوي و أبو إسحاق الحويني و ابن باز و وەزۆربەی زانایانی تریش پێیان وایە ضەعیف و لاوازە

- بەڕێزەکانم لەسەنەدی ئەو فەرموودەیە دا دوو پیاوی نەناسراوی تێدایە وە پچڕانیش هەیە لە سەنەدەکەیدا

- بۆ ئاگاداریتان یەک فەرموودەی صەحیح و ڕاستمان نیە لەسەر فەزڵی سوڕەتی الواقعة ، سوڕەتی الواقعة وەکوو سورەتەکانی تری قورئانە،، وە هەموو سوڕەتەکانی قورئان گەورەو پیرۆزن بێگوومان

## ناوەڕۆك

# ١٥٠

# فەرموودەی

## لاواز و ضەعیف

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

(مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ)

مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

أبُو هَاجَرَةَ الكُرْدِي